زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەڵقەی شەشەم

علی باپیر

# چەند بنەمایەکی گرنگی

# وتاربێژی

نوزاد







بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی
نووسەر: عەلی باپیر
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
ساڵی چاپ: 1427ك – 2006ز
تیراژ: 3000 دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( 125 ) ی ساڵی 2007

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

زنجیرەی بابەتە هەنووكەیی‌یەكان
ئەڵقەی:

# چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی

چاپی یەكەم

علی باپیر

1428 ك — 2007ز



بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە د. عەلی باپیر ، بەڕێز مامۆستا مخلص و

نەوەشێنگەی تەفویضم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم ، خوا پاداشتی چاکەو خێری زیاتر

بخاتە ئیشی و کاریانەوە .

وە جگە لەوان هیچکەسێکی دیکە مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە .

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

ناوی كتێـــب: چەند بنەمایەكی گرنگی وتـاربێژی
نوســــەر: عـەلی باپـیر
بـڵاوكردنەوەی: نوسـینگەی تەفسـیر بۆ بڵاوكردنەوەو راگەیاندن هـەولێـر
خـــــە ت: نەوزاد كـوّیی
بــــەرگ : أمیـن مخـلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەكەم 1428ك – 2007ز
تـــــیراژ: 3000 دانە

لە كتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (      ) ی ساڵی

تەفسیر
بۆ بڵاوكردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا – ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

(ومن أحسن قولاً مِمَّنْ دعا الى الله وعمل صالحاً
وقال إِنَّنـي من المسلمين) (فصلت ـ33)

# پێشکەش بۆ

بەو وتاربێژانەی بە ساغیی و دڵسۆزیی و لێزانیی و لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا ڕوون و ڕاشکاو و بوێرانە خەڵکی لە ڕاستی یەکانی ئیسلام و یاساکانی شەریعەت حاڵی دەکەن و پێش وتاریش بە کردار ئیسلام و بەها بەرزەکانی یان لە خۆیاندا بۆ بەرجەستە دەکەن.

# پێناسەی ئەم نامیلکەیە

خوێنەری بەڕێز:

ئەم نامیلکەیە وەك سەرجەم هاوەڵەکانی دیکەی لە ئەسڵدا وتارێکی بەندە بووە کە بۆ ژمارەیەك لە مامۆستایانی وتاربێژ لە هەولێر و دەوروبەری دراوەو پاش ئەوەی لە کاسێتەوە هێنراوەتە سەرکاغەز[1] پێییدا چوومەتەوە سووکە دەستکارییەکم کردوە، بەم شێوەیەی لێهاتوە، هیواداریشم ئەم نامیلکەیە وێڕای کتێبی (زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟!) یارمەتیدەرێکی باشی مامۆستا وتاربێژو دەرسبێژەکان بێت لە بواری چۆنیەتی وتاردان و دەرس گوتنەوەو ئامۆژگاری کردندا، وە ببێتە مایەی کاریگەر بوون و بەرهەمداربوونی وتارو دەرس و دەوروو ئامۆژگارییەکانیان.




(1) لە لایەن برای بەڕێزم کاك (حیدر مُظفر) هێنراوەتە سەر کاغەزو کاك (زانا حسن بابکر) تایپی کردوە خوا پاداشتیان بداتەوە .

# پێشـــەكى

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه

خواى بەخشەرو بەبەزەيى (سبحانه و تعالى) پاش ئەوەى هەركام لە ئادەم و حەوواى هاوســـەرى -سەلامى خوايان لەسەر بێ- لە لايەك و ئيبليسى نەگريسى لە لايەكى ديكەوە لە ئاسمان و بەهەشـــتەوە ناردنە سەر زەوى، وەك ســـزايەك بۆ سەرپێچى يەكەيان، پێى ڕاگەيـــاندن كە لەمەودوا بۆ بەڕێوەبردنى ژيان و گوزەرانى سەر زەوى خۆيان و وەچەكانيان بەرنامەو ڕێنمايى تايبەتى خۆييان بۆ دەنێرێ و موژدەشى پێداون كە ئەگەر بەپێى بەرنامەو هيدايەتى خوا بەڕێوە بچن و ژيـــانى تاكيـــى و خێزانيى و كۆمەڵيى يان لەبەر ڕۆشنايى شەريعەتى خوادا ڕێك بخەن، ئەوە هەرگيز دووچارى سەرگەردانيى دونياو چارەڕەشـــى و بێمراديى دوارۆژ نابن، وە لە هەمان كاتيش دا هەڕەشەى لێكردوون و ترساندوونى كە ئەگەر پشت لە بەرنامەو ڕێبازى خوا بكەن و لە ڕاستەشەقامى خوا (عزَّ وجلّ) هەتڵەبن، گيرۆدەى ژينتاڵيى دونياو كوێرەوەريى و كوێربوونى ڕۆژى دوايى دەبن! وەك فەرموويەتى: ﴿ قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى ۞ وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْـرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَـةً ضَنْكًا وَنَحْشُـرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

**أَعْمَى﴾** (طه 123،124)، واته: ـ خوا ـ فەرمووی هەردوولاتان پێكەوە لێی بچنە خوارێ كە هەندێكتان دوژمنی هەندێكتانن، جا هەركات لەمنەوە ڕێنمایی تان بۆ هات ئەوە هەركەسێك شـــــوێن هیدایەتی من بكەوێ نە ـ لە دنیا ـ ســـەرگەردان دەبێ و نە ـ لە دوارۆژیش دا ـ ڕەنجەڕۆو بێ مراد دەبێ، بەڵام هەر كەسێك پشت لە یاد (و بەرنامە)ی من بكات ئەوە ـ لە دنیادا ـ ژیانێكـــی تەنگ و تاڵی دەبێ‌و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە كوێری حەشری دەكەین.

جا بێگومان خوای كاربەجێ حیكمەتی وای خواستوە كە پەیـــام و بەرنامەكانی خۆی بۆ ڕێنمایی مرۆڤ و جن قۆناغ بە قۆناغ و بە گوێرەی پێویست بە پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خۆیدا (علیهم الصلاة والسلام) ڕەوانە بكات، وەك فەرموویەتی: **﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ـ75﴾**ـ. واتە: خوا لە فریشتەكان و لە خەڵكی ڕەوانەكراوانی هەڵدەبژێرێ، بێگومان خوا بیسەرو بینەرە.

وەخوای زاناو توانا (عزَّ وجلّ) ڕاشی گەیاندوە كە تەنیا پاش هاتنی پێغەمبەران (صلوات الله و سلامە علیهم)و هەڵسانیان بە هەردوو ئەركی گەورەو گرنگی: موژدەدان و ترساندن، خەڵكی بیانوو بڕاو دەبن، وەك فەرمویەتی: **﴿رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾** (النساء ـ165) ، واته: پێغەمبەرانێكی موژدەدەرو ترسێنەرن تاكو خەڵكی پاش پێغەمبەران (علیهم السّلام) هیچ بەڵگەیەكیان لەسەر خوا نەبێ، وە بێگومان خوا زاڵی كاربەجێیە.

جا دیارە پێغەمبەرانی خوا (علیهم السّلام) ئەركی موژدەدان (تبشیر) بە بەختەوەری دنیاو سەرفرازی لە دوارۆژدا لەكاتی پەیڕەوییكردن لە شەریعەتو، ترساندن (انذار) بەسەرگەردانیی و ژینتاڵیی دنیاو ڕەنجەڕۆیی و ڕۆژ ڕەشیی دوا ڕۆژ، لەكاتی لادان و لاملیی لە شـــەریعەتیان زۆرباش جێبەجێ كردوەو بە تەواوی بوونەتە بەڵگەی خوا بەسەر بەندەكانییەوەو هەموویانیان ـ یان زۆربەیانیان ـ بیانوو بڕاو كردوە.

هەتا پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ كە ئەویش بە حوكمی سەروەر بوون و كۆتایی بوونی بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە هەموویان چاكتر ئەو ئەركەی ئەنجام داوە، وەك لە وتاری حەجی ماڵئاوایی[2] (خطبة حجة الوداع)دا هاوەڵانی بەڕێزی بەچاكترین شێوە شایەدیی یان بۆ داوەو ئۆباڵیان بۆ كێشاوە كاتێك پێی فەرموون: (ألا هَلْ بلَّغْت؟!) ئەرێ پێم ڕاگەیاند؟! ئەوانیش گوتیان (اللهم نعم) بەڵێ ئەی خوایە پێی ڕاگەیاندین، ئەویش پەنجەی موبارەكی بەرەو ئاسمان بەرزكردۆتەوەو پاشان ئاماژەی بۆ ئەو هەموو خەڵك و حەشاماتە زۆرە كە زیاتر لە سەد هەزار (100,000) بوو ون كردوەو فەرموویەتی: (أللهم فأشْهَدْ) ئەی خوایە دەتۆ شایەدبە!

ئنجا ئاشكراشە كە بە (موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا) ﷺ دەرگای پێغەمبەرایەتی و وەحی داخراوە: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ (الأحزاب ـ40)،

(2) وەك لە (صحيح مسلم) دا هاتوە.

بۆیە ئەركی گەورەو گرنگی ڕاگەیاندنی پەیام و بەرنامەی خوا سبحانە و تعالی، وە موژدە پێدان و ترساندنی خەڵكی پاش پێغەمبەری كۆتایی ﷺ ئەركێكە بەپلەی یەكەم كەوتۆتە ئەستۆی زانایانی میراتگری پێغەمبەران، ئەوانەی كە بە گشتی خوای كاربەجێ بە بەندە هەڵبژاردەكانی خۆی ناوی بردوون و پێناسەی كردوون، وەك فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ ۞ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا.﴾ (فاطر ـ 31،32)

واتە: وە ئەو كتێبەی بۆ تۆمان ناردوە هەر ئەوە هەق و ڕاستە، كتێبەكانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێ ـ كە لەلایەن خواوە نێرراون ـ بێگومان خوا بە بەندەكانی شارەزای بینایە. پاشان كتێبی خۆمانمان ـ كە قورئانە ـ كردە میراتی ئەوكەسانەی كە لەنێو بەندەكانمان دا هەڵمان بژاردوون ..

ئنجا بەپێی بنچینەی: (عاقڵ ئەو كەسەیە عەقڵی خەڵكی بێنێتە گەڵ عەقڵی خۆی) وە لە سۆنگەی ئەوەوە كە مامۆستایانی وتاربێژ و ئاڕاستەكەر (موجِّه)ی مسـولمانان قسە بۆ هەموو خەڵكی دەكەن و بە ناوی خواو پێغەمبەری خواوە ﷺ ئامۆژگاریی یان دەكەن و ڕێنمایی یان دەكەن، بۆیە لەسەر تێكڕای مسوڵمانان پێویستە لە هەموو ڕوویێكەوە خەم لە مامۆستایان بخۆن و پشتیان بگرن و هاوكاریی یان بكەن كە لەو ئەركە گەورەو گرنگەی سەرشانیاندا سەركەوتوو بن.

جا یەكێك لە بوارەكانی هاوكاریكردن و پشتگیریی كردنیان ئەوەیە كە بە تێبینیی و سەرنج و ڕەخنەو ئامۆژگارییەكانیان دەوڵەمەندیان بكەن و لە هیچ قسەیەكی خێرو ئاگاداریی وسەرنجێكی بەسوود بۆیان دریغی نەكەن،

بە پێی فەرمانی خوا: ﴿ وَالْعَصْرِ ۞ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ۞ إِلا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ (العصر 1– 3) وە بە پێی فەرمانی پێغەمبەری خواش ﷺ (الدِّين: النصَّيحة. قلنا لمن؟! قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامَّتهم) متفق عليه. واتە: ئایین دڵسۆزیی یە، گوتمان بۆ کێ؟! فەرمووی: بۆ خواو کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی و پیشەوایانی مسوڵمانان و تێکڕاشیان بە گشتی.

ئنجا پێویستە مامۆستایانی وتاربێژیش لە بەرانبەردا زۆر بە دڵفراوانیی و خۆشحاڵیی و تەوازوع و سوپاسکردنەوە تێبینی و سەرنجی خەڵکی ـ بەتایبەت کە لەڕووی دڵسۆزیی یەوە خرابێتە ڕوو ـ وەربگرن و پێیان وانەبێ هەر لەبەر ئەوەی چوونەتە سەر مینبەرو قسە بۆ خەڵکی دەکەن و ئامۆژگاریی یان دەکەن لە هەموو خەڵکەکە چاکترن و لێیان زاناترو شارەزاترن و پێویستی یان بە تێبینی و سەرنج و ئامۆژگاری کەس نەماوە! چونکە بێگومان مەرج نیە هەرچی چووە سەر مینبەرێك لە هەموو ئەوانەی خوار مینبەرەکە چاکترو شارەزاتر بێت، وە مەرج نیە هەر کەسێك بوو بە ئیمام و لە میحڕابدا وەستا، لە هەموو ئەوانەی لە پشتیەوە وەستاون لە خوا نزیکترو پاکتر بێت (عطاءالله السكندري)یش جوانی گوتوە کە دەڵێ:(لاتصاحِب عالماً يَرْضى عَنْ نَفْسِهِ وأيُّ عِلْمٍ لِمَنْ يَرْضى عن نفسه!!) واتە: هاوەڵێتی زانایەك مەکە کە لە خۆی ڕازی یە، جا کەسێك لە خۆی ڕازی بێ کوا زانیاری هەیە؟!

کۆتایی ئەم پێشەکی یەش بە چەند قسەیەکی نەستەقی (علي بن أبي طالب) خوا لێی ڕازی بێ دێنم:

(مَنْ نَصَّبَ نَفْسَه للناس إِماماً فَلْيبدأْ بِتَعْلِيم نَفْسه قبل تعليم غَيْره ولِيَكُنْ تأْدِيبُهُ بِسيرتهِ قبل تأديبه بلسانه، و مُعَلِّمُ نَفْسِهِ و مَؤدِّبُها أَحَق بالأَجْلال مِنْ مُعَلِّمِ الناس ومؤَدِّبِهِمْ)[3]، واته: هەركەسێك خۆی كردە پێشەوا بۆ خەڵكی با لەفێركردنی خۆیەوە پێش فێركردنی خەڵكی دەست پێ بكات، وە با خەڵك فێری ئەدەب و ئاكاری جوانكردنی بە هەڵوێست و ڕەفتاری بێ پێش زمان (و وتاری)، كەسێكیش توانیبی خۆی فێربكات و خۆی بكاتە خاوەن ئەدەب و ئاكاری پەسەند شایستەترە بەڕێز لێگیـران لە كەسێك كە سەرگەرمی فێركردن و ئەدەب دادانی خەڵكە (و خۆی پشت گوێ خستوە)[4]

خواش بەكەرەم ولوطفی بێ سنووری زانیاری و شارەزایی یەكەمان بكاتە بەڵگەی دەستمان بەسەر خەڵكەوە، نەك بەڵگەی خەڵك بەسەرمانەوە، وە ئێمەش بكاتە بەڵگەی خۆی و بەرنامەكەی بەسەر خەڵكەوە، نەك باربین بەسەر ئیسلامەوەو بیانوو و بەڵگەی خەڵك بین بەسەر ئیسلامەوە!

15 ذي القعدة 1427
2006/12/6
هــەولێر

(3) بڕوانە: (سَجْع الحَمام في حِكَم الأمام) ص420، كە كتێبی (منهج علي أبي طالب في الدعوة الى الله) ص 262، لێی وەرگرتوە، كە هی (د سليمان بن قاسم العيد) ە.
(4) ئەوەی نێوان كەوانەكان خۆم زیادم كردوە تاكو ماناكەی ڕوونتر بێ.

# دەستپێك

بەڕێزان !

سەرەتا پێش ئەوەی دەست بە بابەتەكە بكەم دەمەوێ ئەوە ڕوون بكەمەوە كە بەڕاستی ئێمە وەكو ئەهلی عیلم لەهەر ئاستێك دابین وە لە هەر شوێنێك بین پێویستیمان بەوە هەیە كە ڕۆژ بەڕۆژ زانیاری و شارەزایی خۆمان زیاد بكەین، چونكە خوا (جل شأنه) بە پێغەمبەری كۆتایی (علیه الصلاه والسلام) كە لەنێو بەشەردا وە لەنێو پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) لە هەموان زاناترو شارەزاتر بووە لە سورەتی (طه) ـ 114ـ دا دەفەرموێ (وقل رب زدني علماً) بڵێ ئەی پەروەردگارم زانیاریم بۆ زیاد بكە، وشەی (رب)ی بەكار هێناوە چونكە (رب) واتە خاوەن و پەروەردەكەرو مشوورخۆرو سەروەر، جا ئەگەر پێغەمبەری خوا (علیه الصلاه والسلام) پێویستی بەوە بێ كە پەروەردگاری زانیاری بۆ زیاد بكات، ئێمە زۆر زیاتر پێویستیمان بەوە هەیە كە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابین زانیاری و شارەزایی خۆمان زیاد بكەین.

مەبەستم ئەوەیە كە ئێوە وەكو مامۆستایانی بەڕێز دەزانم هەر كامێكتان یان مینبەرتان بەدەستەوەیە یان ئەوی كە نەهێڵدرابێ لەسەر مینبەر بمێنێتەوە یاخود ڕێگەی وتاردانی لـێ گیرابێ، میحرابی بەدەستەوە هەیە، یاخود دەرس بە قوتابیان دەڵێ یان بەلای كەمەوە لە چوار چێوەی

خۆیدا ماڵ و خزمان و خێزان و دەرو دراوسێی و خەڵك ڕوی تێ دەکاو پرسیاری لــێ دەکا وە هەرکامێك لە ئێوە بەتەئکید ئەندازەیەك شارەزایی و زانیاریتان هەیە بەڵام: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ (یوسف ـ76)، تەنیا خوا (جل شأنه) زانیارییەکی دەورەدەرو هەمە لایەن و گشتگیری هەیە. ئەگەر نا ئێمەی ئینسان هەندێ شت دەزانین، وە زۆر شتیش نازانین، وەك شاعیرێك دەڵێ: (عَلِمْتَ شيئاً وَغابَتْ عَنكَ أشياءُ) جامن لەوەی کە دەیزانم لە ئەنجامی ورد بوونەوەم لە قورئان و سوننەت و لە ئەنجامی ئەزموونی خۆم لە مەجالی کاری ئیسلامی و وتاربێژی دا وە لە مەجالی نووسین و دەرس و دەوردا، ویستم کە ئێوەی بەڕێزی لــێ بەهرەمەند بکەم، وە بەتەئکید هەمووشمان پێویستیمان بەیەکتری هەیە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾ (المائدة ـ2) واتە: هاوکاری یەکتر بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی.

ئەوەش بێگومان چاکەکاریی یە کەئینسان لەو زانیارییەی کە هەیەتی لێی بڵاوبکاتەوەو هەوڵ بدا غەیری خۆی لــێ بەهرەمەند بکا، وە بەڕاستی عاقڵ ئەو کەسەیە عەقڵی خەڵك و عیلمی خەڵك دێنێتە گەڵ عەقڵ و زانیاری یەکانی خۆی و خۆی پێ دەوڵەمەند دەکا، جاهیلیش ئەو کەسەیە کە عەقڵ و عیلمی خۆی پێ بەسەو خۆی بێ نیاز پیشان دەدا...

بەڕێزان:

بێگومان ئەمڕۆ تاكە مینبەرێك وەك پێویست و تاڕاددەیەك مابێتەوە بەبۆچونی من كە قسەی حەقی لەسەر بكرێو ئەو ڕاستییانەی لەسەر بخرێنە ڕوو كە خەڵك پێویستی پێیان هەیە بۆ دین و ژین، مینبەری پێغەمبەر (علیة الصلاة والسلام)ە، مینبەری مزگەوتەكانن، ئەوەش نەك هەر من بیڵێم، بەڵكو یەكێك لە عەلمانییەكان كە هەندێكیان هەن ئەندازەیەك ئینصاف و ویژدانیان هەیە، لە هەفتەنامەی هاووڵاتیدا شتێكی نووسیبوو دوای ئەوەی باسی ئەوە كرابوو كە لەمەودوا وتاری مامۆستایەكان كە لەسەر مینبەرەكان دەیخوێننەوە سنووردار بكرێ و لە لایەن ئەوقافەوە كۆنتڕۆڵ بكرێو پێیان بڵێن چ بڵێن و چ نەڵێن، ئەو كابرایە هەندێ قسەی بە ئینصافانەی نووسیبوو وتبووی تەنیا مینبەری مزگەوتەكان ماون كە ئەوەی خەڵك دڵی پێ خۆش دەبێ وە بەرچاوی خەڵكی پێ ڕۆشن دەبێتەوە، لەسەری بگوترێ، ئێوە لە جیاتی ئەوەی ئەو مینبەرەش كەمینبەری مزگەوتە دایبخەن هەوڵبدەن مینبەری دیكەی ئازاد بكەنەوە با قسەی حەق و ڕاست و ئازادانە لە شوێنی دیكەشەوە بكرێ، نەك ئەو تاكە مینبەرەش دابخرێ، جا لەڕاســـــتی دا مینبەری مزگەوت كە هەركام لە مامۆستایان لە گەڕەك و لە دێو لە دەورو بەری خۆیدا هەفتانە خەڵكی بە ئیختیاری خۆیان بۆی كۆدەبنەوەو بە عیبادەت و طاعەتێكیشــــی دەزانن كە كۆببنەوەو گوێش بگرن بۆ مامۆســــتا، ئەوە بەڕاستی نیعمەتێكی زۆر گەورەیەو پێویستە باش بیقۆزینەوە لێی

بەهرەمەند بین، ئەوە هەر ئێمە وەکو ئەهلی ئیسلام و خەڵکی مسوڵمان و دیندار ئەو نیعمەتەمان هەیە، خەڵکی دیکە دەبێ بەپارە خەڵك کۆ بکاتەوە ئەوکاتەش هەندێك هەر بەنابەدڵی دێن، بەڵام تۆی مامۆستا بەئاشکرا خەڵکت بۆ کۆدەبێتەوەو دێتە بەر دەستت لەسەر خۆشی بەعیبادەت دەزانێ کە گوێت بۆ بگرێ وە شەرعیش لەسەری پێویست دەکا کە بێ ئاگا نەبێ و خۆی مەشغووڵ نەکاو کەس لەکاتی وتاردا قسە لەگەڵ یەکتری نەکاو بەڵکو تەسبیحیش لە دەست وەرنەدەن چونکە لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتو (علیه الصلاة والسلام) (ومَنْ مَسَّ الحَصى فَقَدْ لَغى)[5] واتە: هەرکەسێك لەبەردەمی خۆی دەست لەدەنکە چەو وەردا ئەوە لەغوی کردوە، واتە شتێکی پووچی کردوە کەخێرو پاداشتی بەشدار بوونی نوێژی جومعەکەی کەم دەکاتەوە، بۆیە پێویستە بە ئەرکی خۆمان هەستین و لەو نیعمەتە باش بەهرەمەند ببین.

جا ئەو بابەتەی کە پێشـــکەشـــتان دەکەم بۆ ئەوەیە بەرچاوومان ڕۆشـــنتر بێتەوە کە ئێمە وەکو مامۆستایانی وتاربێژ پێوستە چۆن بکەین، بۆ ئەوەی وتارەکانمان و قسەکانمان لە دڵ و دەروونی خەڵکدا باشتر جێگیر بێ، وە باشتر لێی بەهەرەمەند بن وە لە نیعمەتی وتاری ڕۆژی جومعەو کۆبوونەوەی مسوڵمانان لە ڕۆژی جومعەدا کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە جۆرە جەژنێکی مســــوڵمانانی نـاوزەد کردوە زیاترو چاکتـر لێی بەهرەمەند بین، بابەتەکەشم لە بیست بنەما پێك هاتوە:

(5) رواه مسلم عن أبي هريرة (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي،ج 18ص 81 ، رقم 5954

## 1- ســاغيى و دڵسـۆزيى (الاخـلاص والنصّــح)(6):

ئەمە يەكەمين بنەمايە بۆ ئينسانى وتاربێژ  خطيب- كە بريتيە لە ساغى و دڵسۆزيى (اخلاص) لەسەر كێش (وزن)ى (إفعال)ە (أخلَصَ ـ يُخلِصُ ـ اخلاصاً). واتە: (ساغى كردەوە ـ ساغى دەكاتەوە ـ ساغ كردنەوە) (اخلاص) واتە: ئينسان كردەوەكەى خۆى ساغ بكاتەوە بۆ خواو خڵتەى پێوە نەهێڵێ. (نُصْح)يش واتە: دڵسۆزيى و پەرۆش بەرانبەر بە خەڵكى.

بەڵــێ مامۆستايان! قسەكردن بۆ خەڵك و ئامۆژگارى و بانگكردنى خەڵك بۆلاى خوا چاكترين كردەوەيـــە، وەك خواى پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ (فصلت ـ33)، لێرە صيغەى ئيستفهامى ئينكاريى بەكارهاتوە، واتە: (قسەى كێ چاكترە لە هى كەسێك كە خەڵك بۆ لاى خوا بانگ دەكا ـ قسەى هيچ كەسێك لەو قسەيە چاكتر نيە ـ وەكردەوەى باش دەكاو دەڵێ من لە مسوڵمانانم).

---

(6) وشەى (نُصْح) جيا يە لە وشەى (وعظ)، چونكە (موعظة) بەماناى ئامۆژگارى دێ، بەڵام (نصيحة) هەرچەندە لە زمانى كوردى دا لە جياتى ئامۆژگارى بەكاردێ، بەڵام لە زمانى عەرەبى دا بەماناى دڵسۆزيى دێ، وە دەشگونجێ (نُصْح) بەبێ خڵتەيى مانا بكرێ چونكە (توبةً نصوحاً)، لە ئايەتى: (ياأيها الذينَ آمنوا توبوا الى الله توبةً نصوحاً) التحريم ـ8ـ يانى گەڕانەوەيەكى پاك و چاك و بێ خڵتە و خاڵ، ديارە باباى دڵسۆزيش دڵى بێ خڵتەيە!

جا كەواتە خەڵك بۆ لای خوا بانگ كردن كە جۆرێك لە جۆرەكـــانی خەڵك بۆ لای خوا بانگ كردن وتاری جومعەیە ، دەبێ:

یەكەم: بەساغیی (إخلاص)ەوە بیكاو بەشی غەیری خوای پێوە نەهێڵێ و ژەنگ و ژاری پێوە نەبێ، ئەمە بۆ بەینی خۆمان و خوا (عزَّ وجلَّ).

دووەم: بەدڵسۆزییەوە بێ، دڵسۆزیی و پەرۆش (نُصْح) بۆ بەینی خۆمان و ئەو خەڵكە كە قسەیان بۆ دەكەین، چونكە (نُصْح) واتە دڵسۆزیی بۆ خەڵك كە لەگەڵیاندا دڵســـــــۆزو بەبەزەیی و بەپەرۆش بی و هیچ مەبەستی دیكەت پێیان نەبێت تەنیا ئەوە نەبێ كە بەهرەمەندیان بكەی، خوای پەروەردگار دەربارەی (اخلاص) دەفەرموێ: ﴿فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ﴾ (الزمر ـ2). دیارە ڕوو لە پێغەمبەر (علیه الصلاة و السلام) دەكات و دەفەرموێ: بەندایەتی بۆ خوا بكە ، وەگەردن كەچیی خۆتی بۆ ساغ بكەوە. واتە بۆ كەسی دیكە گەردن كەچ مەبە ، وە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ (البينة ـ5). واتە: فەرمانیان پێ نەكرابوو بەوە نەبێ كە بەندایەتی بۆ خوا بكەن گەردن كەچی خۆیان بۆ خوا ساغ بكەنەوەو خڵتەی پێوە نەهێڵن.

هەروەهـــــــا لەو فەرموودەیەدا كە (عمـر) - خوا لێی رازی بێ - دەیگێڕێتەوەو بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان كردوە تەنها خوا پێ مەبەست بوون كراوەتە مەرجی قبووڵكرانی كردەوەكان: (انما الأعمال بالنیات، وإنما لكل امرءٍ مانوی) واتە: كردەوەكان بە پێی نیەتەكانن، (وا تە كردەوە باشەكان ئەگەرنا كردەوەی خراپ ئەگەر نیەتیش باش بێ هەر خرا پە كردەوەی خراپ بە نیەتی باش باش نا بێ، بەڵام ل ێرە مەبە ست لە

(الأعمال) کردەوە چاکەکانە کە تەنیا بەهۆی نیەتەوە بەردەکەون) (وا نما لکل امرئٍ ما نوی) واتە: وە بۆ هەر ئینسانێك بە پێی ئەو نیازو مەبەستەی کە لە دڵیدایە کردەوەکەی بۆ حیسابە. کەواتە کردەوەی باش هەرچەندە بەرواڵەت باش بێ ئەگەر نیەتەکەی لەگەڵ نەبێ و نیازو مەبەستەکەی ساغ نەبێ، ئینسان دەبێتە سەپانی پووشێ و لێی بەهرەمەند نابێ.

دەربارەی (النصح)یش پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (الدین النصیحة) واتە دین دڵسۆزییە بۆ خەڵك.. جا لێرەدا ئێمە بۆیە دەڵێین: (دڵسۆزیی بۆ خەڵك) چونکە قسە بۆ خەڵك دەکەین، ئەگەر نا دڵسۆزیی یە کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەوە تەفسیری کردوە کاتێك پرسیویانە: (لِمَنْ؟) دڵسۆزیی بۆ کێ؟! فەرموویەتی (لله ولکتابه ولرسوله ولائمة المسلمین وعامتهم)، واتە: دڵسۆزیی لەگەڵ خوا (جل شأنه)و لەگەڵ کتێبی خواو لەگەڵ پێغەمبەری خواو لەگەڵ گەورەی مسوڵمانان وە لەگەڵ مسوڵمانان بە گشتی .

بەڕاستی مامۆستایانی بەڕێز! ئینسان هەتا (إخلاص ونصح) لەقسەو لە هەڵسوکەوتەکانی دا زیاتربێ واتە لەگەڵ خوا ساغتر بێ و بۆ خەڵك دڵسۆزتر بێ، قسەکانی باشتر جێ دەگرن وەبەراستی جوان گوتراوە کە پێشینی باشمان گوتوویانە: (قسەی کابرای قسەکەر لەکوێ بێتەدەر دەچێتە ئەو شوێنەی باباى بیسەریشەوە)، ئەگەرقسەکەی لە دڵەوەبێ دەچێتە نێودڵی، وە ئەگەر هەروا سەرزارەکی بیکا ئەویش هەروا سەرزارەکی وەری دەگرێ، بەڕاستی ئەوە تاڕاددەیەکی زۆر وایە..

## 2ـ زانایـی و شـارەزایی (العـلم والخبـرة):

كەسێك كە قسە بۆ مسوڵمانان دەكا پێویستە لە دینـدا زانـابێ و لە ژینیشتتتدا شارەزابێ، چونكە زانایی جیایە لە شـارەزایی، خوای پەروەردگاریش هەردوو سیفەتەكەی بۆخۆی بەكارهێناون لەچەند شوێنان، بۆ نموونە: دەفەرموێ ﴿إن الله كان علیماً خبیراً﴾ (النساء ـ35)، (علم) بریتیە لە زانیاری خوای پەروەردگار بەشتەكان (الأشیاء) بەڵام (خبرة) سیفەتی خوای پەروەردگارە دەربارەی شارەزایی شەخسـەكان و دەربارەی حاڵەتەكان، (علم) بریتیـە لەوەی كە ئینسان دەربـارەی شـتەكان زانابێ و بیانزانێ، بەڵام (خبـرة): ئەوەیە كە بە شەخسەكان یاخود بە هەڵسوكەوتەكان ئاشنابێ و بیانناسێ.

بەڵێ ئەوە كە ئینسان لە دیندا زانابێ وە لە ژیان و خەڵكیش شارەزاو پێیان ئاشنابێ، هەردووكیان زۆرپێویستن بۆ ئینسانی وتاربێژ، كە پێم وایە ئەم ئایەتەی سوورەتی یوسف ژمارە (108) هەردووكیان كۆدەكاتەوە كە خـوا (جل شأنە) بە پێغەمبـەری خۆی (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ واتە: تۆبڵێ ئەمە ڕێبازی منە بەرەو لای خوا (خەڵك) بانگ دەكـەم، بۆیە (مفعول)ەكە (محذوف)ە چونكە سیاقەكە دەلالەتی لەسەردەكا، واتە خەڵك بەرەو لای خوا بانگ دەكەم (علی بصیرة) لەبەر ڕۆشنایی دا واتە لەبەر ڕۆشنایی دا

لە (دین)ی خوادا وە لەبەر ڕۆشنایی دا بە واقیعی خەڵك. هەم زانیاریم هەیە بەدینی خوا، چونکە ئەگەر خەڵك بۆ دینی خوا بانگ بکەی دەبێ لە (دین)دا شارەزابی، وەهەم دەشزانم کێش بانگ دەکەم و چۆنیان بانگ دەکەم و شارەزایی و ئاشنایەتیشم هەیە بەو خەڵك و بەو واقیعەش کە تێدام و کارە بانگەوازی یەکەی تێدادەکەم (انا ومن اتبعني) دەفەرموێ: من و ئەوانەی شوێنم کەوتوون ئەوە پیشەمانە کە لەبەر ڕۆشنایی داو بە زانیاری و بە بەرچاو ڕوونییەوە خەڵك بۆلای خوا بانگ دەکەین (وسبحان الله) وەپاکی بۆ خوا کە بە بەرچاو لێڵیی خەڵکی بۆلا بانگ بکرێ (وما انا من المشركين) وە من لە هاوبەش دانەران نیم، هاوبەش بۆ خوا دانەران بە جەهل و لاساکردنەوە بەدوا دەکەون، بەڵام من لەبەر ڕۆشنایی داو بە بەرچاوڕوونی یەوە خەڵك بۆلای خوا بانگ دەکەم خۆم و ئەوانەش کە بەدوای ڕێبازی من دەکەون، جا زانیاری بە دین بە پلەی یەکەم و سەرەکی شارەزاییە بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، بەڕاستی ئیمام شافیعی ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ، جوانی گوتوە لەو شیعرەدا کە دەڵێ:

كلُ العلوم سوى القران مشغلةٌ
وسوى الحديث والفقهِ في الدين
العلم ماكان فيه قال حَّدثنا
سوى ذلك وسواسُ الشياطين

کە مەعناکەی بەکورتی ئاوایە: هەموو زانیاری یەکان جگە لە قورئان وە جگە لە فەرمایشتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هەمووی هەر سەرقاڵی و سەرگەرمکردنە (العلم ماکان فیهِ قال حدثنا) زانیاری ئەوەیە کە (قال)ی تێدابێ وەك دەگوترێ: (قال الله) جل شأنه، وە (حَّدثنا) یانی فلاَن کەس بۆی باس کردین یا فلاَن کەس پێی گوتین تا دەچێتەوە سەر پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، لێرەدا مەبەســـتی ئیمام شـــافعی رەحمەتی خوای لەسەر بێ عیلمی شەرعی یە کە عیلمی شەرعی بریتیە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) کە قورئان بە (قال) دەست پێ دەکات (قال الله جل شأنه) وە سوننەتیش بە سلسیلەی (حَدثَّنَا) فلاَن لە فـــلاَنەوە تا دەچێتەوە سەر پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەست پێدەکا، (سوی ذلك وسواسُ الشیاطین) غەیری قورئان و سوننەت، بەناوی دینەوە بگوترێ وەسوەسەی شەیتانەکانە.

جا بۆ ئەوەی وتاربێژ ـ خطیب ـ لە قســـەی هەڵبەسـتراو و ناڕاست پارێزراو بێو قسەکانی کاریگەر بن دەبێ شارەزایی قووڵ لە قورئان و سوننەت پەیدا بکاو بە ئایەت و حەدیسی راستی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەڵگە بێنێتەوە، جگە لەوانەش قسەو نووسراوی ئەو زاناو پێشـــەوایانە بکاتە بەڵگـــە کە جێی متمانەی تەواون و خاوەنی زانیارییەکی فراوان بوون، نەك هەر قوڵەنەزیلەیەکی بینی باوەڕی پێ بکاو بەناوی دینەوە بۆ خەڵکـــی باس بکات! چونکە مەرج نیە ئەوەی بەناوی دینەوە نووسراوە هەمووی راست بێ، کەواتە: کە بە ناوی عیلمی

شەرعيی قسـە دەكرێ دەبێ لە وەحيەوە سەرچاوە بگرێ، وەحيش تايبەتە بە خوای پەروەرەدگـارەوە كە ئەويش بۆ پێغەمبـەری ناردوە (عليه الصلاة والسلام).

كەواتە مەبەست لە زانياری بۆ مامۆسـتاو وتاربێـژ ئەوەيە كە لە قورئان و سونەتدا شارەزابێ و پێويستە ئايەت و حەديس لە وتارەكەيدا هەبێت، وەك لە (صحيح)ی بوخاری و موسليم و لە سيـرەی پێغەمبەردا (عليه والصلاة والسـلام)دا هاتوە دەڵـێ: پێغەمبـەر (عليه الصلاة والسلام) زۆرجار وتارێكی داوە لەسەر سوورەتێك ـ وتاری ڕۆژی جەژن ـ جاری وابووە بەس سوورەتی (ق)ی تەفسيركردوە، ياخود سوورەتی (القمر)ی تەفسير كردوەو خوێندوە، هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دەڵێن فلان سوورەتەمان لە دەمی موبارەكی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) وەرگرتوە كە لەسەر مينبەر خوێندوويەتيەوە لە ڕۆژی جومعە يان لە ڕۆژی جەژندا، پێويسـتە وتار بناغەكـەی بريتی بێ لە ئايەتەكانی خوای پەروەردگار، وە پاشان فەرمايشتەكانی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسـلام)، ئەوە بە نسـبەت زانايی لە ديندا، بەڵام بۆ شارەزايی لە ژيندا كە ئەويش پێويسـتە وتاربێژ هەيبێ، بريتيـە لە شارەزايی بەواقيعی ئەو خەڵكە كە قسەيان بۆ دەكا كە ئەوەش زۆر پێويستە، چونكە ئينسان تا بەو خەڵكە شارەزا نەبێ كە قسەيان بۆ دەكاو پێيان ئاشنا نەبێ نازانێ چی يان بۆ باس بكا، ڕەنگەشتێكيان بۆ باس بكا، كە هەرچەندە ئەوشتە حەق بێ و چاك بێ و ڕاست بێ، بەڵام بە كەڵكی

ئەوان نەیەت و زەرەریان لـێ بدات، بۆیە ئەوە زۆر گرنگە کە ـ خطیب ـ ئاشـنابێ بەو خەڵکەی کە لەگـەڵیان دەژی و بەو واقیعەی تێیدا دەژی، هەروەها ئاشنابێ بە پاشخانی فیکریی و سیاسی و بە هەڵسوکەوتیان، وە بزانێ ئایا لە ڕووی ئیمـان و عەقیدەوە چۆنن، ئایا لە عەقیدە تێگەیشتوون یان نا؟! ئەگەر عەقیدەو ئیمانیان وەرگرتوە شتی دیکەیان بۆ باس بکا وەك عیبادەت، ئەگەر عیبادەتیان چاك بوو باسی هەڵس وکەوت و ڕەوشت ئەخلاق و حەڵاڵ و حەرامیان بۆ باس بکا، ئەگەر ئەوەشیان چاك بوو، باسی شتی دیکەیان بۆ بکا وە هەروەها.....

بەڵێ بەبێ شارەزایی لە خەڵك ئینسان قسەکانی پڕ بە پێستی ئەو واقیعە نابن کە قسەکانی تێدا دەکا، ئینجا ئەوەش بەوە دەبێت لە نزیکەوە تێکەڵی خەڵك بێت و، بۆ وتارەکەشی خۆی بۆ ئامادە بکات و ئەوەی پێویست بێ بیخوێنێتەوەو بیری لـێ بکاتەوە، من هەر جارەی دەچم بۆ مزگەوتێك بۆ نوێژی جومعە تەماشا دەکەم هەندێك لە مامۆستایان چاك خۆی بۆ وتارەکە ئامادە نەکردوە، قسەیەکی ئێستا دەڵێ لە نیوەی وتارەکەش دەیلێتەوە دواییش سێ بارەی دەکاتەوە، کەئەمە وتارەکە لاواز دەکاو گوێگر بێزار دەکا، کەواتە کە دەڵێم بە زانایی و بە شارەزایی قسە بکرێ، ئەوە بە خۆ ئامادەکردن دەبێ، ئینسان ئەگەر خۆی بۆ ئامادە نەکات و کاتێکی باش بۆ وتارەکەی تەرخان نەکات، ناتوانێ قسەکانی لە ڕووی عیلم و لە ڕووی شارەزاییەوە بن، چونکە ئەو بابەتەی کە دەیەوێ باسی بکا دەبێ زۆربەی ئەو ئایەت و فەرمایشتانە بێنێ کە پەیوەندیان

پێوەی هەیە، ئنجا ئەو واقیعەش یان ئەو مەسەلەیەش کە قسەی لەسەر دەکا، دەبێ لێی شارەزابێ، بۆ وێنە باسی دەستووری هەرێمی کوردستان دەکرێ، مەعقوولٚ نیە مامۆستا باسی پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان بکاو نەیخوێندبێتەوەو لێی شارەزا نەبێ! چونکە خوای پەروەردگار نەهیمان لێ‌دەکا کە قسە لەبارەی شتێکەوە بکەین پێی شارەزا نەبین، دەفەرموێ: **﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾** (الأسراء ـ36)، واتە: بەدوای شتێك مەکەوەو قسەشی دەربارە مەکە کە زانیاریت دەربارەی نیە، چونکە بیستن و دیتن و عەقڵ هەموو ئەوانە لێپرسینەوەیان لەسەر دەکرێ و لەگەڵ دەکرێ.

## 3- لێزانیی و قسە ڕوونیی (الحكمة والبيان):

مامۆستا بەڕێزەکان!

خوا (جل شأنه) دەربارەی داوود (عليه الصلاة والسلام) لە سوورەتی (ص) ئایەتی(20)دا، لە سیاقی باسکردنی ئەو بەهرەو موعجیزانەی کە بە داودی بەخشیون دەفەرموێ: ﴿وآتيناه الحكمة وفَصْلَ الخِطاب﴾ واتە: وە بە داوودمان بەخشیبوو حیکمەت و (فصل الخطاب) حیکمەت زۆر پێناسەی کراون، ڕەنگە باشترینیان ئەوە بێ کە بریتیە لە (قسەی بەجێو کرداری بەجێ) واتە: حەکیم کەسێکە قسە لە شوێنی خۆیدا بکاو کردەوەش لە جێی خۆیدا ئەنجام بدا، (فصل الخطاب)یش واتە قسەی ڕوون، دواندنەکەی بۆ خەڵك ڕوون و ئاشکرابێ، ئەوە بەڕاستی زۆر گرنگەو خوا (جل شأنه) لە چەند شوێنان لە قورئاندا دەفەرموێ: پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لەسەریان پێویستە بە ڕوونی دینی خوا لە خەڵك حاڵی بکەن، بۆ وێنە لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (35) خوا (جل شأنه) دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ عَلَى الرُّسُلِ إِلاَّ الْبَلاغُ الْمُبِينُ ﴾ ئایا پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) جگە لە ڕاگەیاندنی ڕوون و ئاشکرا چی دیکەیان لەسەرە! واتە: پێویستە لەسەریان کە ئەوەی خوا پێی فەرموون زۆر بەڕوونی و بەبێ پێچ و پەنایی و بەڕاشکاویی و بەبێ پەردەیی لە خەڵکی حاڵی بکەن، جا جاری وا هەیە ئینسان بۆ خۆی وا دەزانێ، کە ئەو مەبەستەی لە دڵی دایەو خۆی چاك دەیزانێ خەڵکیش دەیزانێ، بۆیە بەکورتی ئاماژەیەکی پێ دەکاو وا دەزانێ خەڵك لێی حاڵی

بوون، بەلاَم ڕەنگە یان خەڵك هەر لێی حاڵی نەبوبێ یان بەلینە گەو قووچی لێ حاڵی بووبن، لەبەر ئەوە من داوای برایانەم لە مامۆستایانی بەڕێز ئەوەیە كە وانەزانن ئەوەی كە خۆیان دەیزانن و لە مێشك و دڵیاندا ڕۆشنە، خەڵكیش دەیزانن و بە دوو وشە لێیان حاڵی دەبێ، بەڵكو دە بێ جوان، جوان، نوختەیان بۆ بخەنە سەر پیت، وە لە ( صحیح)ی ( بخاري ومسلم)دا هاتوە كە دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی(7): پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) وەكو ئێوە قسەی نەدەكرد كە قسان ڕیز دەكەن و بەپەلە دەیانكەن، بەڵكو قسەكانی دەنك دەنك بوون و ئەگەر كەسێك ویستبای وشەكانی بژمێرێ بۆی دەژمێردران!.

بەڵێ دەبێ وتاربێژ قسەكانی ڕوون بن و تێكیان نەخاتەوە بە صلیە ڕیزیان بكات! بەڵكو دەبێ ڕستە ڕستە لەو شوێنەی كە ڕستە كۆتایی پێ دێت بوەستێ، بۆ ئەوەی قسەكان مەفهووم بن، وە خەڵكەكە لێی حاڵی بێ و لێی تێبگا، چونكە ئەو خەڵكە جۆرەها ئاستی تێدایە وە لە كۆتایی ئەم بنەمایەدا باگوێ لە فەرموودەیەكی دیكەش بگرین كە (ترمذي) لە دایكمان (عائیشە) خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، عائیشە دە ڵێ: ( ما كان رسولُ الله ﷺ يَسرِدُ سَرْدَكم هذا، ولكنَّه كان يتكلَّمُ بِ كَلامٍ يُبيِّ نُهُ، فَصْلُ، يَحْفَظُهُ مَنْ جَلَسَ اليه). واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ڕیزكردنی ئێوە قسەی ڕیز نەدەكردن بەڵكو بە شێوەیەك قسەی دە كرد ڕوو نی دەكردەوە، ڕۆشن بوو، هەركەسێك لەلای دانیشتبایە قسەكانی لە بەر دەكرد.

(7) (عن عائشة قالت: إنَّ رسول الله ﷺ لَمْ يكُنْ يَسْرُدُ الحديث كَسَرْدِكُمْ، كانَ يُحَدِّثُ حديْثاً لوعَدَّهُ العادُّ لأحصاهُ) رواه البخاري ومسلم .

## 4- ڕێکخستن و ڕیزبەندیی‌کردنی قسەکان
## (تنظيم و ترتيب الكلام)

بنەمایەکی دیکەی گرنگی وتاربێژی ئەوەیە کە وتاربێژ قسەکانی ڕێك بخاو ڕیزبەندیان بکاو تەرتیبیان بکا، ئەمەش زۆر خاڵێکی گرنگە، ئەگەر سەیر بکەین دەبینین سوورەتەکانی قورئان هەموویان ـ د یارە کەلامی خوای پەروەردگار لە قەدەر خوایە (جل شأنه) بەڵام دە بێ ئێ مەش لە قورئانەوە فێربین ـ وە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) هەموویان بە پێشەکیەك دەست پێ‌دەکات و زۆر ڕوونە، وە دوایی بە ئەنجامێك کۆتایی دێت. واتە تێکەڵ و پێکەڵ نین، بۆ نموونە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) کە دەفەرموێ: (حق المسم على المسلم ستٌ) رواه مسلم، بۆچی وا ڕیزبەندیان دەکاو بۆچی بۆ شەش تەوەرە ما فەکانی مسوڵمان لەسەر برای مسوڵمانی دابەش دەکا؟ بۆ ئەوەی چاکتر لێی تێبگەین یان دەفەرموێ: (اجتنبوا السبع الموبقات)متفق عليه، واتە: خۆتان لە حەوت گوناحە فەوتێنەرەکان بپارێزن، دوایی باسیان دە کا (الا شرك بالله وحقوق الوالدين .....) تا کۆتایی، وە بۆ نموونە دەفەرموێ: ( سبعة يظلهم الله في ظله يوم لاظل الا ظله امام عادل وشاب نشأ في عبادة الله عزّ وجل .....)متفق عليه، تا کۆتایی، بەڵێ ئەوە زۆر گرنگە کە ئەو قسانەی دەیانکەی باش ڕێکیان بخەی و ڕیزیان بکەی من بە ئەزموونی خۆشم بۆم دەرکەوتوە کە ئینسان ئەگەر بێت و قسەکانی خۆی جا لە وتاری جومعەدا

بێ یان هی جـــەژن و هەر وتارێكـــی دیكەدا یان لە دەرسـێك دا ئەگەر قسەكانی ڕێك بخات و بە سەروبەریان بكاو وتارەكەی پێشەكییەكەی دیار بێو ئەصلی بابەتەكەی دیاربێ و دوایی ئەنجامەكەشی دیار بێ، ئەوە بەڕاستی ئەگەر نێوەرۆك (محتوی)ی وتارەكەی باش بێ وتارێكی بە سوود دەبێ و خەڵكی لێی بەهرەمەند دەبێ، وە جاری وا هەیە وا پێویست دەكا وتاربێژ قسەكانی خۆی دابەش بكا بۆ چەند تەوەرەیەك و تەوەرەكان دیاری بكا، (1 ـ 2 ـ 3 ـ 4 ـ) وە دەبێ سەرەنجامەكەشی دیار بێ، ئنجا دەبێ ئەوەی پێویستە لە پێشەوە بگوترێ لە دوایی نەیڵێ، ئەوەی لە دوایی دەیڵێ لە پێشەوە نەی گوتبێ، ئەوەش زۆر خاڵێكی گرنگە بۆ ئەوەی كە خەڵك ئەو قسەو وتارەكە تۆ پێشكەشیان دەكەی باشتر لێت وەربگرن وە سوودی لـێ ببینن، دیارە هەندێك جاریش هەیە وا چاكە بۆ تەئكید مەسەلەیەكی گرنگ دووبارە بكرێتەوە، بەڵام نابێ ئەوە بكرێتە شتێكی گشتی و هەمیشەیی ..

## 5 و 6 و 7ـ ڕەچاوكـردنى ئاسـت و پێويسـتى خـەڵـك و، لـە گرنگتـرەوە بۆ گرنـگ چــوون و، شـتى تـازە پێـبوون
## (مُراعاة مستوى النـاس وحاجتهم، الأهـم فالـمهم، التجدّد)

ئەمانەش سێ بنەمان بەڵام من پێكەوەم هێناون، مامۆستايانى بەڕێز!

1- ڕەچاوكردنى ئاســـت و پلەى تێگەيشـتنى خەڵك زۆر گرنگە، لە (صحيح)ى بوخارى دا هاتوە كە (علي) خوا لێى ڕازى بێ دەفەرموێ: (حَدِّثُوا الناس بما يعرفون أَتُحِبُّون أَنْ يُكذَّب اللهُ و رَسولُه؟) واتە: لە قەدەر عەقلى خەڵك قســە بكەن، پێتان خۆشــە خەڵك درۆ پاڵدا تە لاى خواو پێغەمبەرى خوا؟! چونكە كەشـــتێكيان پێ دەڵێى و لە عەقڵيانەوە ناچێ، دەڵێن وەڵڵا ئەوە ڕاست نيە! بۆيە دەبێ وريابين و لە قەدەر عەقڵى خەڵك قسە بكەين، بەڵێ ڕەچاوكردنى ئاستى خەڵك زۆر گرنگە، ئايەت هەيە ئەگەر بۆ دكتۆر يان ئەندازيارێكـى بخوێنيەوەو بۆى شى بكەيەوە زۆر سوودى لــێ دەبينێ. بەڵام ڕەنگە بۆ جوتيارێكى بيخوێنيەوە يان نەفەرێكى ســادە، لێـــى حاڵى نەبێ، هــەروەها هــەندێك فەرمايشـــتى پێغەمبەر هەيە (عليه الصلاة والسلام) وەكو دەرمان و چارەسەر وايەو خواردن(غذاء) نيەو بەكەڵك هەموو خەڵك نايەت، خۆراكيش هەموو جۆرێكى ديارە بەكەڵك هەموو خەڵك نايەت و ئێمە دەبێ ئەوە بزانين كە لە قورئان و

سوننەتدا هەندێك شت هەیە وەك خۆراكەو هەندێك شتیش وەكو دەرمانە، بۆ نموونە: باسكردنی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ[8] كە یەكێك (99) كەسی كوشتوەو دەیەوێ تۆبە بكات لە یەكێك دەپرسێت دوای ئەو هەموو قەتڵە تۆبەی لێ وەردەگیرێ یان نا؟ وەڵام بە نەخێر دەدرێتەوەو سەرەنجام ئەویش دەكوژێ و دەبێتە (100) كەس، ئنجا بۆ لای زانایەك رێ دەگرێتەبەر بە مەبەستی تۆبەكردنی یەكجاریی و پاش ئەوەی پرسیار لە زانایەكە دەكات و ئەویش بۆی روون دەكاتەوە كە: بەڵێ ئەگەر بێت و بەراستیی و ساغیی بگەرێتەوە لای خوا، خوا لێی خۆش دەبێ، كابرا بە مەبەستی دینداریی و طاعەتی خوا بەرەو شارێك رێ دەگرێتەبەر كە زانایە كە ئامۆژگاری دەكات بۆی بچێ و ئنجا كە نیوەی رێگا زیاتر دەبرێ و وەفات دەكات و خوای گەورە تۆبەی لێ قبوڵ دەكاو دەیبوورێ... ئەم فەرمایشتە دەرمانی كەسێكە كە لە رەحمەتی خوا نائومێد دەبێ و لەبەر گوناهی زۆری بێهیوا دەبێ لە لێبوردنی خوا، بەڵام وەك خۆراك بەكەڵك نایەت و ناشێت لە هەموو جێگایەك و بۆ هەموو كەس بیخوێنیەوە، چونكە كەسێك (10) كەسی كوشتبێ و بە نیازی تۆبە بێ و ئەم فەرموودەیە ببیستێ، دەڵێ جارێ زۆرم ماوە وەك كابرا بگەمە (100) كەس و دوایی تۆبە دەكەم! دیارە ئەوەش كە لە جۆری

(8) كە (بخاري و مسلم) گێراویانەتەوە.

خۆراکە دیسان بە کەڵك هەموو ئاستەکان نایەت، بەڵێ ئا ئەوە حیکمەت و لێزانی‌یە، کەدەڵێین ئینسان دەبێ حەکیم و لێزان بێ لێرەدا دەردەکەوێ، ئینجا وێرای رەچاوکردنی ئاستی خەڵك لە رووی فیکریی و زانستی و سیاسی و حاڵەتی کۆمەلایەتی یان، مەسەلەی پێویستی خەڵکیش زۆر گرنگە، ئێمە دەبێ سەیربکەین خەڵك چی پێویستە نەك خۆمان چیمان پێخۆشە، ئەگەر یەکێك لە نوێژخوێنان حاجی‌یەك، سۆفییەك، ریش سپییەك، سەرۆك عەشیرەتێك، کە تۆی تووڕەکردوە، نابێ بۆ وتاری داهاتوو جامی تووڕەیی خۆت بە سەر نوێژخوێنەکانتدا بڕێژی! بەڵکو تۆ سەیربکە ئەوان چییان پێویستە نەك بۆخۆت ڕقت لەچی هەڵساوەو چیت پێ‌خۆشە، یان بۆخۆت دەتەوێ چی بڵێی، بەڵکو دەبێ بزانی ئەو خەڵکە پێویستی بە چ قسەیەك هەیە کە بۆیان بکەی و چ شتێکیان زیاتر پێویستە.

2- لە گرنگترەوە بۆ گرنگ چوون: لە (صحيح البخاري)دا هاتوە کە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ (معاذ بن جبل)ی ـ خوا لێی رازی بێ ـ نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: ئەی موعاذ با یەکەمین شتێك کە تۆ خەڵکی بۆ بانگ دەکەی بریتی بێ لە تەنیا خواپەرستی و بەندایەتی بۆ خوا، جا ئەگەر بۆ ئەوە وەلامیان دایەوە پێیان ڕابگەیەنە کە خوا لە شەو و ڕۆژدا پێنج نوێژی لەسەر فەرزکردوونە، وە ئەگەر بۆ ئەوەش وەلامیان دایەوە پێیان ڕابگەێنە کە خوا زەکاتی لە سەر پێویست

كردوون! واتە سەرەتا ئیمان و عەقیدە وەك بناغەی ئیسلامەتی ئن جا عیبادەت و زەكات وەكو بەرهەمی ئیمان و عەقیدە، چونكە ئە گەر ئیمان و عەقیدە نەبێ ئینسان خوا ناپەرستیو نوێژ ناكا، وە نو یژێك كە لەسەر ئەساسی ئیمان و عەقیدە نەكرێ بەكەڵك نایەت. وە ئەگەر عیبادەت نەبێ هیچ شتێك پاڵ بە ئینسانەوە نانێ كەئین سان ماڵی خۆی ببەخشێ، وە ئەگەر بیشی بەخشێ مادام بۆ خوا نەبێ ل ێی بەهرەمەند نابێ!

3- شتی تازە پێبوون: هەروەها وتاربێژ دەبێ هەوڵ بدا هەمیـ شە شتی تازەی پێبێ، یانی قسەكانی هەر ئا سایی و عادەتی نەبن، د یارە ئەوەش بەوە دەبێ وەك پێشتر باسم كرد، كە خۆی ئامادەب كات و لە سەرچاوەكان بگەڕێ، چونكە وتاربێژ مادام ئەوە كارێكی سەرەكییەتی و كارێكی گەورەو گرنگیشە، دەبێ خۆی بۆ ما ندووبكاو هەمیـ شە هەوڵبدا لە شتی تازە ئاگاداربێ و مەعلووماتی تازە بە خەڵك رابگەیەنێ، شتی تازە بەو مانایە كە وتاربێژ هەر ئەو مەعلووما تە سادەیەی لانەبێ كە ئەو خەڵكە بیستوویەتی و لایەتی، بەڵكو دەبێ ئەو خەڵكە وا هەست بكا كە ئەو وتاربێژە زانیاری وای پێیە كە ئەوان پێیان نیە.

مەبەستیشم لە (مەعلووماتی تازە) تەنیا شـتێك و دوو شـت نیە، بەڵكو پێویسـتە بابای وتاربێژ هەم لە بواری زانیاری شـەرعیدا رۆژ بۆ

ڕۆژێ زیاترو چاكتر لە قورئان و سوننەت تێبگات و بە پێی ڕووداوەكان و پێویستی سەردەم و گۆڕانی ڕۆژگار تەفسیرو شـــەرحی نوێ و پڕ بە پێست لەسەر ئایەت و فەرمایشـــتەكان بكات و گومانیشی تێدانیە كە قورئان وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لايَخْـــلَقُ على كَثْـــرةِ الَّردِّ) هەرچەندە زۆر دووبارە بكرێتەوە كۆن و شڕ نابێ و هەر تەڕو تازەیە!

هەروەها پێویستە لە بواری شارەزایی واقیعیشدا جا چ لەڕووی فیكری و عیلمیی یەوە چ لە ڕووی سیاسی، چ كۆمەڵایەتی چ ئابووری..... هتد، بەردەوام ئاگاداری گۆڕانەكان و شتە بنەڕەتی و گرنگەكان بێت.

## 8 ـ گرنگی دانی زۆر بە ئیمان و عەقیدە
## (الأهتمام الكثير بالأيمان والعقيدة)

مامۆستایانی بەڕێز! ئێمە كە وتار بۆ خەڵك دەدەین و دەمانەوێ زیاتر شارەزایان بكەین لە ئیسلام و پێیان بگەیەنین، پێویستە لە بناغەو ئەساسی ئیسلامەوە دەست پێبكەین، پێش هەموو شتێك ئیمان و عەقیدەی ڕاستی ئیسلامیان بۆ ڕوون بكەینەوەو لێیان حاڵی بكەین، چونكە ئەگەر وەك پێویست لە ئیمان و عەقیدە گەیشتن و لە دڵ و دەروونیاندا چەسپی، ئەوە ئیمان و عەقیدە پەلكێشیان دەكات بۆ پابەندیی تەواو بەحوكمە ئیسلامیەكان و لانەدان لەشەریعەت .

كەواتە پێش ئەوەی گلەیی لە خەڵك بكەین و تێبینی سست بوونیان لە عیبادەت و، كردنی هێندێك كردەوەی هەڵەو خراپ لە كێشان و پێوان و بازرگانی و مامەڵەو هەڵسوكەوتی دیكەیان بخەینە بەرچاوو ڕەخنەیان لێ بگرین، پێویستە ئیمان و عەقیدەیان تێبگەیەنین، چونكە تا تەصەووراتی خەڵك تێك نەچێ تەصەرووفاتیان تێكناچێ، بۆیە دەبێ هەمیشە هەوڵ بدەین لە سەرچاوەوە دینداریی ئەو خەڵكە ڕوون بكەینەوەو ساغی بكەینەوەو چاك و ڕاستی كەینەوە، ئەو كاتەش ماندووبوونی زۆری ناوێ، چونكە ئەگەر ئیمان و عەقیدە تەواو بێ كە گوتت ئەو شتە حەرامە! خەڵك نایكات و لێی دوور دەكەوێتەوە، وە كە گوتت ئەو شتە فەرزە خەڵك

دەیکا، دیارە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەخۆڕایی نەبووە کە (13) سێزدە ساڵی ڕەبەق لە مەککە خەریکی فێرکردن و چەسپاندنی سێ ئەسڵ بوو:

یەکەم: کە خوای پەروەردگار بەخەڵکی بناسێنێت و وایان لێبکات خوا بەیەکبگرن وە خوا پەرست بن وەتەنیا خوا بەپەروەردگار و پەرستراوی خۆیان و حوکم ڕانی خۆیان و خاوەنی خۆیان بزانن،

دووەم: ئیمانیـــــان پێ پەیدا بکا بە وەحی و بە پێغەمبەرایەتی، بەوە کە خوا (جل شأنە) بەرنامەو دەستووری ژیان بۆ خەڵك دادنێ.

سێیەم: پاشان خەریکی ئەوە بوو لە خەڵك بگەیەنێ کە ڕۆژێك دێ لێیان دەپرسرێتەوەو ســـزاو پاداشت و بەهەشت و دۆزەخ هەیە، دوای ئەوەی ئەو سێ ئەسڵەی فێری خەڵك کرد (التوحید ـ النبوة ـ المعاد) خوا بەیەکگرتـن وە پێغەمبـەرایەتی وە دوارۆژو لـە دڵ و مێشـکیانـــی داچەسپاند، دوایی کە دەیفەرموو ئەو شتە خوا قەدەغەی کردوە یان خوای پەروەردگار ئەو شتەی فەرزکردوە، هیچ توشی زەحمەت نەدەبوو، بەڵکو ئەوەی خوا فەرزی کردبوو خـــەڵك دەیکـــرد ئەوەش کە خوا قەدەغەی کردبوو خۆیان لـێ بە دوور دەگرت.

## 9- ڕەچاوکردنی دڵخۆشکردن و ئاسانکاریی و خۆ دوورگرتن لە سڵەماندنەوەو وەزەحمەت خستن.
## (مراعاة التبشير والتيسير وتجنُّب التنفير والتعسير)

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە فەرمایشتێکدا کە (بخاري ومسلم) لێی دەگێڕنەوە، دەفەرموێ: (بشِّروا ولا تَنفِّروا ويَسِّروا ولا تُعَسِّروا) واتە: دڵخۆشکەر بن و سڵەمێنەرەوەو دوورخەرەوە مەبن، وە ئاسانکەربن و وە زەحمەت خەر مەبن، من ڕۆژێك گوێم لە مامۆستایەکی بەڕێز بوو وتاری دەدا دوای مانگی ئەم ڕەمەزانە، وتارەکەی ئەوەندە ڕەشبینانەبوو خەڵکەکەی زۆر نائومێد کرد، دەیگوت هەرکەسێ دوای ئەم مانگی ڕەمەزانە غەیبەتی کردبێ، یان درۆیەکی کردبێ، یان حەرامی خواردبێ، ئەوە با بەتەمای یەك زەررەش لە پاداشت و ئەجری ئەو هەموو نوێژو تەراویح و ڕۆژووەی ڕەمەزان نەبێ، کە بەڕاستی زۆرم پێ سەیر بوو چونکە وانیە!.

ئنجا دەیگوت هەرکەسێ دوای ڕەمەزان شەرابی خواردبێتەوە کافربووە، ئەوە بەڕاستی زۆر هەڵەیەو دەبێ ئێمە زۆر وریا بین، کە مەعلووماتی هەڵە نەڵێین، چونکە مسوڵمان بە شەڕاب خواردن کافر نابێ بەڵکو گوناهبار دەبێ و گوناهێکی گەورەی ئەنجام داوە، ئنجا گرنگە کە ئێمە بزانین ئەصل دڵخۆشکردنی خەڵکەو هاندانیانە بۆ چاکتر بوون، بە

تايبەتی كە وتاربێژ قسە بۆ مسوڵمانان دەكات ئەوانەی كە دۆستی خوان و هاتوون بۆ ماڵی خوا دەبێ دڵيان خۆش بكەين و زياتريان هان بدەين بۆ ئەوەی چاكتر بن نەك نائومێديان بكەين و دڵيان سارد بكەين وە واش پيشـــان نەدەين كە ديندارييى و مسوڵمانەتی و طاعەت بارێكی قورسەو كۆڵێكی گرانە هەر بۆيان دەست نادرێتێ و جێبەجێكردنــی بەزەحمەتە! بەڵكو دەبی بۆيان ئاسان بكەين بەڵام لە سنووری شەرعدا ديارە لێرەدا مەبەستم ئەوەنيە كە حەرامیان بۆ حەڵاڵ بكەين، بەڵام بەڕاستی زۆر خاڵێكی گرنگە كە ئێمە هەميشە دڵخۆشكەرو هاندەری خەڵك بين بۆ چاكتر بوونيـــان و زياتر بەرەو خواچوونيـــان و زياتر دينداربوونيان، نەك نائومێديان بكەين و دڵ ســـارديان بكەين! وە دينيشيان وا نەخەينە بەرچاو كە بۆيان ناكرێ، خۆتان دەزانن كە هەندێ گەنج و خەڵكی فام كاڵ و سادە هەن كە ناوی تايبەت لەخۆ دەنێن و خەڵكێكی كرچ و كاڵ و ناحاڵی و نەزانن و هەميشە دەيانەوێ كە مسوڵمانان تووشـــــی زەحمەت بكەن و ئەگـــەر لەگەڵ فلان فەتوا قورسەدا نەگونجان كە مەرجيش نيە ئەوە ڕاستەڕێی ئيسلام بێ يان لەگەڵ فلان مەزهەبە يان لەگەڵ فلان ڕايە فيقهيەدا نەگونجان، زەربێكيان بەسەردا دێنن، جاری وا هەيە لەسەر شتی بچووك هەرای گەورە دەنێنەوە، ئێمە دەبێ زۆر لەوە وريابين كە خاڵێكی گرنگ لە ئينسانی خەطيب و وتاربێژدا ئەوەيە كە دڵخۆشكەر بێت و سڵەمێنەرەوە نەبێت، وە ئاسانكەربێ و وە زەحمەت خەر نەبێ ..

## 10- وریابوون لە تێپەڕاندن و بەزایەدان
## (الحذر من الأفراط والتفريط)

مامۆستایانی بەڕێز! ئێمە دەبێ زۆر وریا بین كە لەكاتی و تاردان و دەرس و ئامۆژگاریماندا بۆ خەڵكی مسوڵمان هاوسەنگیی بپارێزین و نەكەوینە (افراط وتفريط)ەوە واتە تێپەڕاندن و بەزایەدان، بۆ ئەوەی خەڵك بە ناتەوای لە ئیسلام نەگەن، بۆ نموونە: جاری وا هەیە وتاربێژ باسی طاعەت یان چاكەیەك دەكا، هێندەی پێهەڵا دەڵێ ئەو خەڵكە مسوڵمانە وادەزانێ مسوڵمانەتی هەمووی بریتیە لەو شتە، جادیارە ئەوە تێپەڕاندنە، بۆیە پێویستە ئاگادار بین لە كاتێكدا كە باسی چاكەیەك یان خێرو پاداشتی چاكەیەك دەكەین تێنەپەڕێنین بۆ ئەوەی خەڵك تەنیا بەوەندە لێی نەگەڕێ، وە ئاگامان لە تێپەڕاندن بێ لە كاتێكدا كە باسی تۆڵەو سزای گوناهێك دەكەین، لەوەشدا ئاگامان لێ‌بێ تێنە پەڕێنین، هەروەها ئاگامان لە بەزایەدانیش بێ، واتە: ئاگامان لەوە بێ كە ئەوەی خوای پەروەردگار سزایەكی بۆ گوناهێك، یاخود پاداشتێكی دا ناوە بۆ چاكەیەك لەوەشدا بەزایەی نەدەین و خوا چۆنی فەرمووە ئاوا بڵێین، واتە ئێمە لە بۆچوون و لە هەست و نەستی خۆمان نەخەینە سەر شتەكان، بەڵكو حەقیقەتە شەرعییەكان چۆنن ئاوایان ڕابگەیەنین .

مامۆستا بەڕێزەکان! ئەوەی کە دەیڵێم هەمووی بەرهەمی ئەزموونە، بۆ نموونە: ڕۆژێك من گوێم لە وتاربێژێك بوو دەیگوت (عثمان)ی کوڕی (عفّان) - خوا لێی ڕازی بێ - هەموو قورئانی لە ڕکاتێکدا خوێندوە لە شەونوێژدا وە دەیگوت: ئەبوو حەنیفە هەموو قورئانی لە دوو ڕکاتاندا خوێندوە لە شەونوێژدا، جا بۆ زانیاریتان ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نییە، چونکە تۆ سەیر بکە هەر شەو بەش ناکا، وە بەڕاستی یەکێ لە نیعمەتەکان کە لە زیندانی ئەمریکادا خوای بەرزو مەزن لەگەڵی کردم ئەوەبوو کە ئەو شتانەم هەموو تەجروبە کردن، یانی شەو هەر بەش ناکا تۆ هەموو قورئانی تێدا بخوێنێ، ئەگەر لە هەر (20) بیست دەقیقەدا کە زۆر بە خێرایی بیخوێنی ئەگەرنا جزوێکت پێ تەواو ناکرێ، ئنجا ئەگەر بەهەر بیست دەقیقەیەك جوزئێك بخوێنی ئەوە شەو بەش ناکا، دەی کاکە تۆ شتی وا بۆ دەڵێی کە دوایی کابرا دەڵێ: جا ئەمن لەکوێ قورئان لە دوو ڕکاتاندا خەتم بکەم! قەت ناگەمە ئەوە، وە کابرا خۆی لەبەرچاو دەکەوێ، ئنجا ئەوە هاندانی خەڵکە بۆ زۆریی و بۆریی چونکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە حەدیثی صەحیحدا دەفەرموێ[9]: (لایفقه مَنْ قرأ القرآن فـي أقلَّ مِنْ ثلاثٍ) واتە: هەر کەسێك هەموو قورئان لە سێ ڕۆژان کەمتر بخوێنێ تێی ناگا، هەڵبەتە هەر وا شە

(9) رواه أبوداود والترمذي و ابن ماجة و صحّحه السيوطي، بڕوانە فيض القدير، ج 6 ص 585 ، الحديث : 9978 .

چونکە شەو و ڕۆژ لە (10) جوزئان زیاتر بخوێنی زۆر خێرا دەبی و تێیی ناگەی.

ئنجا هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ قورئانیان وانەخوێندوە، جاری واهەبووە ئایەتێکیان خوێندوە (100) سەد جاریان دووبارە کردۆتەوە وە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) جاری وا هەبووە تا بەیانی یەك ئایەت یان یەك ڕستەی لە قورئان دووبارە کردۆتەوە، مەبەستم ئەوەیە ئەو (افراط و تفريط)ە دەبێ زۆر لێی وریابین هەرشتێکمان لە کتێبدا بینی نەیهێنین بیکەینە بابەتی سەر مینبەر، چونکە خەڵك بە تایبەتی خەڵکی ئێستا هۆشیارەو وەکو دەڵێن کاغەزی سپی دەخوێننەوە، تۆ حیکایەتی بۆ دێنی هیچ پەیوەندییەکی بەدینەوە نییە بەناوی دینەوە پێیان دەڵێی لە جیاتی ئایەت و فەرموودەیان بۆ بخوێنیەوە ئەو حیکایەت و شتانە کە زۆری دەچێتە قاڵبی ئەفسانەو شتی هەڵبەستراوەوە، ئەوە بەڕاستی نە لە سەر مینبەر دەوەشێتەوە، وە نە خەڵکیش سوودی لێ دەبینێ بەڵکو لێشی توشی زەرەر دەبن.

## 11- كورتيـى و پوختيى و دووبارە نەكـردنەوە مەگەر لەبـەر پێويسـتييەكى گرنگ (الأختصار وعدم التكرار الاّ للضرورة)

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (ان قصر خطبة الرجل وطول صلاته مَئِنَّة مِنْ فِقهٍ) رواه البخاري، واتە :كورتيى وتارى پياو وە درێژيى نوێژەكەى نيشانەى تێگەيشتن و زانيارييەتى، بۆچى؟ چونكە نوێژ ڕازو نيازو گفتوگۆيە لەگەڵ خوادا (جل شأنه)و هـەتا لە خزمەت خوادا ڕابوەستى جێى خۆيەتى، ديارە مەبەسـت لێرەدا شەو نوێژە ياخود ئەو نوێژانـەى كە بە تەنيا دەيانكەى، ئەگـەر نا نوێژى بە كۆمەڵيش دەبێ موراعاتى ئەهلى جەماعەت بكەى پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) وەكو لە (بخاري ومسـلم)دا هاتوە فەرموويەتى: هەر كەسـێك بە تەنيا نوێژى كرد با بە كەيفى خۆى درێژى بكاتـەوە، بەڵام ئەگەر نوێژى بۆ خەڵكى كرد با كورتى بكاتەوە چونكە خاوەن كاريان تێـدا هەيە، نەخۆشيان تێدا هەيە، پەككەوتەيان تێدا هەيە، كەواتە دەبێ هەوڵبدەين وتارمان كورت و پوخت بێ و ئەوە نيشانەى تێگەيشتوويێتى يە.

بەڕاستى ئەو فەرمايشتەى پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) زۆر وردو بەجێيە، چونكە ئەگەر ئينسـان چاك شـارەزابێ و ئەو مەبەستەى كە دەيەوێ بيگەيەنێ بە خەڵك بۆخۆى چاك لە مێشـكى خۆيدا كوڵاندبى و ڕۆشنى كردبێتەوە، دەتوانێ بە كورتى و بە پوختى ڕايبگـەيەنێ، بەڵام

ئەگەر بێت و خۆی چاك لێی حاڵی نەبووبێ، یاخود چاك لە مێشكی خۆیدا نەیكولاندبێ، هەر دەیجوێت و دەیجوێتەوەو لەوسەر هەندێ دێنێ و لەوسەری هەندێكی دەباو دووبارەی دەكاتەوەو سەرەنجام نوێژ خوێنەكانیش بەو شێوەیە لێی حاڵی نابن و خۆشی زۆر ماندوو دەكا، دیارە هەندێك جار لەبەر بارودۆخ و زرووفی خەڵك و شوێنەكە وا پێویست دەكات وتارەكە تۆزێك درێژبێ، بەڵام بە شێوەیەكی گشتی پێویستە وتاربێژ وتارەكەی درێژ نەبێ و باشترین قسەو ڕستەش ئەوەیە كە كورت و پڕ مانا بێت و مادام هەفتانە ئەو خەڵكە بۆ وتاربێژ كۆدەبنەوە پێویستە بە بەرنامە قسەیان بۆ بكات و نابێ بیەوێ ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتوە بەیەك جومعە هەموویان لێ حاڵی بكات! بەڵكو دەبێ مەبەست و وتارەكانی دابەش بكات بۆ چەند جومعەیەك بۆ ئەوەی خەڵكەكە ئامۆژگاری و وتارەكە باشتر وەربگرن، وە بۆ خۆشی هێندە خۆی ماندوو ناكات و شتەكانیشی هێندە لێ ئاڵۆز نابن.

ئنجا دەربارەی مەسەلەی نووسینی وتاریش ئینسان دەگونجێ سەرباسەكان لە پارچە وەرەقەیەكدا بنووسێ یان ئەگەر لە مێشكی خۆیدا حازریان بكا باشترە، بەڵام وتار نووسین و خوێندنەوەی لەسەر كاغەز شتێكی سەر كەوتوو نیە وە شتێكی ڕاستیش نیە، چونكە وتار جیایە لە (قراءة و تلاوة) وە (خطبة) لە (خطاب)ەوەیەو ئەوەیە تۆ ئەو خەڵكە بدوێنی، وە بەڕاستی ئاوا باشتر خەڵك تەفاعولت لەگەڵ دەكات،

باشــتر کاریان تێ دەکەی و دەزانن کە دەیاندوێنــی، بەڵام تۆ وەرەقەیەکی دەخوێنیەوە، دەڵێن ئەوە بۆ خۆی شتی خۆی دەخوێنێتەوە، بەڵام وتار ـ خطبة ـ ئەوەیە کە تۆ بیاندوێنی و قسەیان لەگەڵ دا بکەی و سەرنجیان رابکێشــی و هەوڵ بدەی کە بێتـــاقەت نەبن و تا کۆتایی وتـــارەکە لەگەڵتدابن و خەویان نەیەت و سوود ببینن .

## 12- ڕوونكردنـەوەى چەمكـى وشـە كـليلييـەكـان
## (إيضــاح مفاهيـم الكـلمات الأسـاسـيـة)

بەڕاستی ئەم بنەمایە بە بنەمایەکی زۆر گرنگ دەزانم کە بریتیە لە ڕوونکردنەوەی چەمکی وشە کلیلیـــەکان واتە: ڕوونکردنەوەی واتای ئەو وشانەی کە وەکو کلیل وان بۆ تێگەیشتنی قورئان و تێگەیشتنی سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) و تێگەیشتنی مسوڵمانەتی و ئیسلام، وەکو وشەی ئیسلام، ئیمان، تەقوا، عیبادەت (برّ)، (احسان)، چەندین وشەی دیکەی لەم بابەتە، کە ئەگەر ئەو وشانە ئینسان بۆ خەڵکیان چاك ڕوون بکاتەوە، خەڵك چاکتر لە دین حاڵی دەبن، چونکە جاری وا هەیە مامۆستا دەڵێ: خەڵکینە بە تەقوا بن و تەقوا شتێکی گەورەیە یان ئەوەی بە تەقوا نەبێ ئاوایە، بەڵام خەڵك نازانێ (تەقوا) چیە! دەبێ لێیان حاڵی بکەی، کە تەقوا واتە پارێز لە بێفەرمانی خواو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) یان وشەی (إله) من گوێم لە هەندێك لە مامۆســـتایانی بەڕێزمان بووە وشەی (إله) یان بە (خوا) تەفسیر کردوە، وا دەزانن وشەی (إله) یانی (الله) کە ئەمە وانیەو ئەو دوو وشەیە زۆر لێك جیان، (إله) واتە پەرستراو کە خوای کاربەجێ نەفی دەکا، ئولوهیەت نەفی دەکا لە غەیری (الله) (لا اله الا الله) واتە: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، یان دەفەرموێ: ﴿ أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ ﴾(الفرقان ـ 43)، واتە: دەبینی

ئەو كەسەی ئارەزووی خۆی كردۆتە پەرستراو (إله)ی خۆی، یان دەفەرموێ: ﴿واتخذوا مِن دون الله ءالِهةُ﴾ (مريم ـ81). له جیاتی خوا هەندێك پەرستراویان پەیدا كردوون، كەواتە (إله) تاكە (اِلهين اثنين) جووتەو (آلهة) كۆیە، بەڵام (الله) نە (تثنية) دەكرێ و نە (جمع) دەكرێ، كەواتە (إله) لەگەڵ (الله) جیایە، جا ئەوە لێرەدا شتێكی عەقیدەیی پێوە پەیوەستە بۆیە بە نموونەی دێنمەوە، كاتێك ئێمە دەڵێین (لا اله الا الله)، واتە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، من زۆرجار گوێم لە مامۆستای وابووە، گوتوویەتی: بێجگە لە خوا هیچ خوانین، جا ئەمە زۆر هەڵەیە، چونكە خوای كاربەجێ بۆیە پێغەمبەری نەناردوە (عليه الصلاة والسلام) لە خەڵكی بگەیەنێ كە هەر یەك ـ الله ـ خوا هەیە، بەڵكو لە خەڵكی گەیاندوە كە هەر یەك پەرستراو هەیە، كە (الله)یە، چونكە ئەوە كە یەك خوا هەیە بە یەكێ لە شتە ڕۆشن و ئاشكراكان زانراوە، خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ (الزمر ـ38) واتە: ئەگەر لێیان بپرسی كێ ئاسمانەكان و زەوی دروست كردوون؟! دەڵێن خوا، پێغەمبەران بۆیە هاتوون (عليهم الصلاة والسلام) ئەو خوا (الله)یە كە هەموو بەشەر لەسەری كۆكن و خاوەن و بەدیهێنەرو پەروەردگاری كائیناتە هەر ئەو بپەرسترێو بەندایەتی بۆ بكرێ، ئەوە جێگەی مشتومڕی نێوان پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و نەیارەكانیان بووە، كە تەنیا (الله) بپەرستن و تەنیا (الله)

(إله) بێ، خەڵكی كافريش گوتوويانە نەخێر دەبێ غەيری خوا ـ الله ـ ش (إله) پەرستراو بێ.

كەواتە (إله) واتە پەرستراو، بۆيە فيرعەون بە (موسی) دەڵێ: ﴿لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ﴾ (الشعراء ـ29) واتە: ئەگەر غەيری من بكەی بە پەرستراو (إله) رەگەڵ گيراوانت دەخەم، واتە: خەڵكی ديكەشم زۆر گرتوون، وەبە دەست و پەيوەندەكەی دەڵێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي﴾ (القصص ـ38) واتە: ئەی دەست و پەيوەندەكەم و ئەوانەی لەدەوری منن جگە لە خۆم پەرستراوێكی ديكەم بۆ ئێوە پێ شك نايە، بەڵام نەيگوتوە من خوا (الله)م، گوتوويەتی من (إله)م، يان گوتوويەتی من (ربّ)م ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ (النازعات ـ24)، ﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَى﴾ (طه ـ49) واتە: پەروەردگاری ئێوە ئەی موسی كێيە؟! فيرعەون نەيگوتوە من خوا ـ الله ـ م، گوتوويەتی من پەروەردگارم، واتە دەبێ ئەمرو نەهی بەدەست من بێ، وەگوتوويەتی من پەرستراو (إله)م، واتە دەبێ خەڵك بۆ من ملكەچ بێ و بۆمن گوێڕايەڵ بێ و من بە بەرزو پيرۆزو گەورە بگرێ و لە قسەم دەرنەچێ!

جا ڕوونكردنەوەی چەمك و واتاكانی ئەو وشانە بۆ خەڵكی زۆر گرنگە تاكو چاكترو قووڵتر لە ئيسلام تێ بگەن، من كاتێك لە زيندانی ئەمريكادا بووم هەندێك لە سەرانی ڕژێم كە لەگەڵم بوون وەكو لە كتێبی (ئەشكەنجە و زيندان)دا باسكراوە، ژمارەيەكيان دوای ئەوەی ماناو چەمكی

وشەی (دین)م بۆ ڕوون كردنەوە، زۆر گۆڕانیان بەسەردا هات[10]، پێم گوتن كە دین بە چوار واتا بەكارهاتوە لە قورئاندا:

یەكەم: بە مانای سـزاو پاداشت بەكـارهـاتوە وەكو: ﴿ مَـالِكِ يَوْمِ الدِّيـــنِ ﴾ (الفاتحة ـ4).

دووەم: بە مانای گەردن كەچیی بەكارهاتوە وەك: ﴿أَلا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾ (الزمر ـ3)، واتە: گەردن كەچیی ساغ بۆ خوایە. یان دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾ (البقرة ـ139) واتە: لەگەڵیان بجەنگن تاكو ئازاردانی مسوڵمانان لە لایەن كافرانەوە نامێنێ وە ملكەچیی تەنیا بۆ خوا دەبێ.

سێیەم: بە مانای بەرنامەی ژیان هاتوە وەك دەفەرموێ: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ (الكافرون –6) خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێ (علیه الصلاة والسلام) ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ!.... لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ واتە: بڵێ ئەی كافرەكان..... دینی خۆتان بۆ خۆتان دینی خۆم بۆخۆم، یان دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ﴾ (یوسف ـ76) واتە: یوسف بۆی نەبوو بەپێی دینی مەلیك واتە بەرنامەو مەنهەجی مەلیك، كە مەلیك كابرایەكی كافر بووە، بۆی نەبووە براكەی لەلای خۆی بە بارمتە بهێڵێتەوە، بۆیە بەبرایەكانی گوت: چی لێبكەم ئەگەر دزی كردبێ؟! گوتیان سزایەكەی ئەوەیە بیكەیە بارمتە لەلای

(10) ئەوكاتە وام دەبینی، جا نازانم دوایی چۆن دەبێ

خۆت، یاخود بە کۆیلە چونکە لە دینی (یعقوب)دا سزای دزی کە کەسێك دزی بکردایە دەبوو بە بارمتە یاخود کۆیلەو خزمەتکاری ئەو کەســەی کە دزی لــێ‌کردوە، دیارە یوســف (علیه الصلاة والسلام)یش ـ کاری بە قانونی مەلیك کردوە ـ لەوێ دەیزانی بە پێی قانونی مەلیــك و بە پێی دین و بەرنامەی مەلیــك بۆی نیە براکەی(بنیامین) لای خۆی بهێڵێتەوە، بەڵام بە پێی دینی (یعقوب) (علیه الصلاة والسلام) بۆی هەبووە، بۆیە ئەوانی سەرپشك کردو گوتی: باشە سزای چییە ئەگەر دزیبووی؟! ﴿قَالُواْ جَزَآؤُهُ مَن وُجِدَ فِي رَحْلِهِ فَهُوَ جَزَاؤُهُ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ (یوسف- 75) واتە: وتیان هەرکەسێك دزی کردبوو با خۆی ببێتــە بارمتەی (یاخود ببێتە سزای) دزییەکەی و ببێتە کۆیلەی ئەو کەسەی کە دزی لــێ‌کردوە.

جا ئێستا زۆربەی خەڵکی نازانێ کە (دین) واتە بەرنامەی ژین، نازانێ کە دیموکراســی دینە، عەلمانیەت دینە، سۆســیالیزم دینە، لیبرالیزم دینە، عەولەمە دینە، هەرشتێك کە خەڵك بەدوای بکەوێ و پەیڕەویی لــێ‌بکا ئەوە دینیەتی، بەڵکو خەڵکێك پێی وایە (دین) واتە پەیوەندی نێوانی خۆی و خوا، واتە: تەنیا لایەنی ڕووحی، نازانێ کە (دین) واتە بەرنامەی ژیان.

چوارەم: دین بەمانای ئیســلامیش دێت، وەك خوای زانا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ﴾ (آل عمران ـ19)، واتە: دینی ڕاست و ڕەوا لای

خوای پەروەردگـــار تەنیا ئیسلامە، وە خەڵك ئەگەر بزانێ (دین) واتە: (بەرنامەی ژیان) لای خوا تەنیا ئیسلامە، نابێتە مارکسی و شیوعی و لیبـرالیـی و عـەلمانیی و سەرمایەدارییی و..... و هەر ڕۆژە ڕوو لە قیبلەیەکی ناکاو ڕوو لە (كعبة الله) وەرناگێڕێ.

بەڕاستی ئەو وشـــە کلیلی یانە زۆر گرنگن ئێمە چەمکەکەیان بۆ خەڵکی جوان ڕوون بکەینەوە، نەك هەر بە خەڵکی بڵێین بەتەقوابن، کاکە بەدوای دینی پیرۆزی ئیسلام بکەون کە ئەم وشەی (پیرۆز) بۆ (دین) هەر بەکارنەهێنرێ باشە، چونکە خەڵکی ئەوکات بە شێوەی متفەرك و وەك شتێکی پیرۆزی ڕووت تەماشای ئیسلام دەکا، بەڵکو با بگوترێ ئاینی ڕاستی ئیسلام، خوا نەیفەرمووە: دینی من پیرۆزە واتە: وشەی موقەددەسی بۆ بەکارنەهێناوە، بەڵکو دینی حەق (دين الحق)ی بۆ بەکارهێناوە، بەرنامەی خوا (دين الله)ی بۆ بەکارهێناوە، دینی ڕاست (ديناً قيماً)ی بۆ بەکارهێناوە دینی ڕێك و ڕاست دینی تەواو، بۆیە پێویستە ئێمەش ئەو وشەو تەعبیرانە بەکار بێنین کە خوای پەروەردگار دینی خۆی پێ پێناسە کردوون، بۆ ئەوەی خەڵك مەفهوومێکی هـەڵە لە ئیســـــلام وەرنەگرێ و بزانێ هەروا شـــتێکی موقەددەس و موتفەڕکـــــە بەڵام بەدوای هەر بەرنامەیەکی دیکە بکەوێ قەیدێ ناکا!!

## 13- درەوشاندنەوەی ڕاستیی گشگیریی و هەمە لایەنەیی ئیسلام (تجلية حقيقة شمولية الإسلام وكماله)

بەڕاستی درەوشانەوەی ئەو حەقیقەتە كە ئیسلام بەرنامەیەكی گشتگیرو هەمە لایەنەیی ژیانە، بۆ ئەم زەمانەی ئێمە لە لایەن مامۆستایان و وتاربێژەكانەوە زۆر گرنگە، چونكە خەڵك مەفهووم و واتای دینی لە لا بچووك بۆتەوەو بەداخەوە زۆر لە كلتوورو فەرهەنگی ئەورووپیەكان ئێستا لەنێو ئێمەدا ڕەنگی داوەتەوە، سەیر دەكەی لە ئەورووپا هەركاتی خۆیشی ئایینی مەسیحی پێش تەحریف كرانیشی بایی ئەوەی نەدەكرد كە ژیانی خەڵك ڕێك بخات، چونكە عیسى (عليه الصلاة والسلام) كە خوا (جل شأنه) ناردی و ئینجیلی پێدا ڕەوانەكرد بۆ ئەوە نەبوو ببێتە بەرنامەی تێرو تەواوی ژیان، بەڵكو ناردبووی كە لەگەڵ تەوراتدا بەرنامەی ژیان بێ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ (آل عمران -50)، وە ئینجیل هەندێك تەعدیلات وگۆڕانكاری كردبوون لە تەوراتدا، یاخود ئەو زیادە ڕۆییەی كە جولەكەكان پەیدایان كردبوو لای برد، وە لە بنچینەدا نەصرانیەت بەشی ئەوەی نەدەكرد كە ژیانی خەڵك ڕێك بخات، سەرەڕای ئەوەش دوایی گۆڕانیان بەسەردا هێناو وانیشان درا كە ئایین تەنیا بریتیە لە پەیوەندی نێوان خواو ئینسان، بەداخەوە ئێستا ئەوەی خۆی زۆر بە

شارەزا دەزانێ لە عەلمانییەکان لە ئاستی بەرزو نزمیاندا تێگەیشتنێکی کلێسابییان دەربارەی ئیسلام هەیە لە حاڵێك دا کە ئیسلام زۆر دوورە لەو مەفهووم و تەعریفە کە دەڵێ دین دەوڵەتی تێدا نیەو شەریعەت و سیاسەت لێك جیان !!

بۆیە زۆر پێویستە ئێمە خەڵکی خۆمان لەو ڕاستییە تێبگەیەنین کە دینی خوای پەروەردگار دینێکی گشتگیرە، دینێکی هەمەلایەنەو تێرو تەواوە، وەکو خوا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾ (المائدة ـ3) بەڕاستی ئەو دینەی خوای پەروەردگار بەرنامەیەکی تێرو تەواوە، بۆ بوارەکانی جیهان بینی، ئیمان و عەقیدە، عیبادەت، ئەخلاق و ڕەوشت، دروستبوونی خێزان، بۆ هەموو ئەمانە ئیسلام خاڵی خستۆتە سەر پیت و هیچ کەلێن و بۆشایی نەهێشتۆتەوە، بەڵام بۆ بوارەکانی دیکەی وەك: سیاسەت و حوکم و جەنگ و ئاشتی و مەسەلەی ئابووری و ئەو لایەنانەی دیکە کە پەیوەندییان بە لایەنی ماددی ژیانەوە هەیە، زیاتر هێڵی گشتی داناون، بۆ ئەوەی دەست و پێی خەڵك نەبەستێ بە سیستەمێکی دیاری کراوەوەو بەپێی زەمان و کات و شوێن و پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و هەلومەرجەکان مسوڵمانان بتوانن لە سنووری شەرعدا بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارو ژیانیان ئیجتیهادی تازە بکەن.

کە باسی گشتگیریی ئیسلامیش دەکەین مەبەستمان ئەوەیە کە ئیسلام باس لە هەموو لایەنەکانی ژیان دەکات و چارەسەرو دەرمانی بۆ هەموو گرفت و دەردێك داناوە، چونکە خوا (جلَّ شأنه) کە دروستکەری هەموو بوونەوەرەو ڕابردوو ئێستاو داهاتووی ئینسان و شتەکان دەزانێ هەر ئەویش چاك دەزانێ، چ شتێك بە کەڵکی ئینسان دێ و دەگونجێ بۆ ئەوەی ببێتە بەرنامەی ژیانی، وە دەزانێ چ شتێك لەگەڵ سروشت و فیطرەتی ئینسان دەگونجێ، بۆیە ئەو دینەی پەروەردگار بۆ ئینسانی ناردوە تێرو تەواو و بێ کەم وکوڕی یە لە هەموو بوارەکانی عەقیدەیی و سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و ...... هتددا وە خوای پەروەردگار لە سێ سووڕەتان دا لە سورەتی (التوبة)ـ33 و (الفتح)ـ28 و (الصف)ـ9 یەك ڕستەی دووبارە کردۆتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ ﴾ واتە: خوا (جل شأنه) ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خۆی ڕەوانە کردوە بە ڕێنمایی و بەرنامەی ڕاستەوە، لێرەدا خوای زانا ئیسلامی بە دوو وشە پێناسە کردوە (هدى) و (دین الحق)، کەواتە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دین و شەریعەتێکی هێناوە کە پەروەردگار بە دوو وشە پێناسەی کردوە:

یەکەم: (هـدى)

دووەم: (دین الحـق)

دیارە ئەو دوو شتەش لێك جودان، (هدی) بریتیە لە لایەنی شەخصی و تایبەتی دینداریی، چونکە ئیسلام پێش ئەوەی ببێتە سیستەم و بەرنامەی ژیان، دەبێتە هیدایەت بۆ ئینسان و دەبێتە ئیمان و عەقیدەو ئەخلاق و ڕەوشت و ڕەفتارو لە شەخصدا ڕەنگ دەداتەوە، دوایی ئەو شەخصانە بە هەموویان ژیانی خۆیان دەگۆڕن و بەو شێوەیە ڕێکی دەخەن کە دینی حەقی خوا دەیخوازێ، ئەوکاتە دینی حەقی خوا دێتەدی، کەواتە هیدایەت لە تاکدا بەرجەستە دەبێ و دینی حەقیش لە کۆمەڵگادا بەرجەستە دەبێ، کە ئەم ڕاستییە زۆربەی خەڵکی لە مێشکیدا کاڵ بۆتەوەو نەماوە، وە عەلمانییەکانیش بەزۆری لێرەوە دزەیان کردۆتە نێو دڵ و مێشکی خەڵك و دەیانکەن بە دیموکراسی و عەلمانی و سۆسیالیستی و دەیانکەن بە چەپی و ڕاستی و ڕوویان پێ لەملاو لەولا دەکەن، خەڵکەکەش پێی وایە هەر مسوڵمانەو نازانێ کە مسوڵمانەتی ئەوەیە تۆ لە هەموو شتێکدا ملکەچی خوا بی، لە ژیانی تاکەسی و خێزانی و لە ژیانی کۆمەڵایەتی و تێکڕای لایەنەکانی دیکەدا، وە ئەو شەریعەتە کە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)دا تەنیا پەیوەندی بە کاروباری شەخصی و تایبەتییەوە نیە وەکو کە لە ئەوروپا دینی عیسی (علیه الصلاة والسلام) دوای تەحریف و گۆڕانی وای لێ هات، بەڵکو ئەودینەی (محمد المصطفی) (علیه الصلاة والسلام) هەم هیدایەت و هەم دینی حەقە، هەم بەتاك جێ بەجێ دەکرێت و هەم بە کۆمەڵ و میللەت.

## 14- قسەكردن لەسەر بابەتەكانی ڕۆژو مەسەلە زیندووەكان (التطُّرق الى المسائل اليومية والقضايا الحيَويّة)

ئەگەر سەیری سیرەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)و جێنشینە سەر ڕاستەكانی (خوا لێیان ڕازی بێ) بكەین، هەركاتێك بابەت و ڕووداوێك یان كارەساتێك بووبێت یان شتێك هاتبێتە پێش، ئەگەر جومعەش نەبووبێ خەڵكیان لە مزگەوت كۆكردۆتەوەو دەربارەی ئەو گۆڕانكاریی و ڕوداوو مەسەلەیە قسەیان كردوە، وەكو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە مەسەلەی ڕۆژگیراندا دوای ئەوەی كە نوێژی ڕۆژگیرانیان كرد وتاری داو فەرمووی: (مانگ و ڕۆژ دوو نیشانەن لە نیشانەكانی خوا بۆ مردنی كەس و بۆ ژیانی كەس ناگیرێن بەڵكو ئەوە دوو نیشانەی خوای پەروەردگارن...)[11] هەر ڕووداوێك و هەر مەسەلەیەك بووبێ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) وە خەلیفەكان (خوا لێیان ڕازی بێ) قسەیان لێكردوە بە تایبەتی لە وتاری جومعەدا، كەواتە وتاری جومعە دەبێ قسەكردن بێ دەربارەی ژیانی خەڵك و ئەو ڕووداوانەی كە لە ژیانی خەڵكدا ڕوو دەدەن، جا بۆیە ئێمە لە یەكێ لە بنەماكاندا باسمان

(11) وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتووە چونكە لەو ڕۆژەدا كە (خۆر) گیرا بوو، (إبراهیم)ی كوڕی بچووكی پێغەمبەریش ﷺ كۆچی دوایی كردبوو، جا هەندێك لە مسوڵمانان پێیان وابوو كە ئەو دوو ڕووداوە پێكەوە پەیوەستن و پێغەمبەری خواش ﷺ بۆی ڕوون كردنەوە كە هیچ پەیوەندییان پێكەوە نیە!

کرد کە بنەمای دووەم بوو وتمان دەبێ وتاربێژ ـ خطیب ـ زۆر شارەزا بێ بە ژیانی خەڵك ئێستا جاری وا هەیە مامۆستایەکی بەڕێز کە ئەهلی عیلمەو بە ئیسلام شارەزایە، بەڵام نازانێ لەنێو خەڵکدا چ دەگوزەرێ، ئنجا کە نازانێ چ باسە، ناشتوانێ تەفاعول بکا لەگەڵ ژیانی خەڵکەکەو خاڵیان بۆ بخاتە سەر پیت و ئەو نەخۆشی و کەم و کوڕییـــــانەی هەیانن چارەسەریان بۆ دابنێ، بەڵکو هەر نازانێ کوێیان دێشێ وە ناشزانێ چییان بەسەر هاتوەو وەزعیان چی لــێهاتوە!.

بۆیە بەڕاستی قسەکردن لەسەر بابەتەکانی ڕۆژ وە ئەو مەسەلانەی کە زیندوون وە خەڵك پێیانەوە خەریکەو گرفتارە پێویستە، جا خێربن یان شەڕبن، شەرت نیە ئێمە هەر ڕەخنە بگرین لە خەڵك، جاری وا هەیە پێویست دەکا هانیان بدەین، بۆ وێنە لە مانگی ڕەمەزان دا کە دەبینین خەڵکی بە گشــتی قۆڵیان لە طاعەت هەڵماڵیوە بە تایبەت خەڵکی شاری هەولێر جێی ئەوەن زۆر مەدح بکرێن و سوپاس بکرێن و تەقدیر بکرێن، یان بۆ نموونە ئێمە کاتی خۆی خۆپیشاندانمان کرد لە دژی ئەو کەسانەی کە بەرانبەر بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بێ ئەدەبییان کردبوو، بەڕاستی جێی خۆی بوو کە زۆر مەدحی خەڵکــــی مسوڵمانی شاری هەولێر بکرێ، وە هەروەها ...... واتە: خەڵك ئەگەر شتی باشیان کرد، بگوترێ باشتان کرد، جا نەك هەر خەڵك، ئەگەر دەسەڵاتداریش شتێکی باش دەکا بڵێ فلان شتەت باشە، دەستتان خۆش بێ شتێکی زۆر

چاکە خوا پاداشتتان بداتەوەو سوپاستان دەکەین، هەرچەندە ئەرکی خۆشتانە، وە ئەگەر شتێکی خراپیشیان کرد بگوترێ: فلاّن شتەتان خراپە، واتە بە چاك بڵێین چاك و بە خراپیش بڵێین خراپ.

هەر شتێکیش لە نێو خەڵکدا ڕوودەدا خراپ و چاك هەڵوێستمان لە بەرامبەریدا هەبێ بە پێی توانای خۆمان، بەلاّم ئاگامان لە بریندارکردنی شەخصی بێ، لە (صحیح)ی بوخاریدا هاتوە کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کاتێك کەسانێك هەڵەیەکیان دەکرد قەت ڕوو شکێنی نەدەکردن، کە بڵێ فلاّن کەس وایکرد، بەڵکو دەیفەرموو: (ما بال أقوام یفعلون کذا وکذا) کەسانێك هەن بۆ ئاواو ئاوا دەکەن؟!، واتە: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەگەر ویستبای ئاماژە بکا بەهەڵەی خەڵك هیچ کەسی بریندار نەدەکرد، بەڵکو بەگشتی شتەکەی باس دەکرد، بەڕاستی ئەوە شتێکی زۆر گرنگە، چونکە هیچ کەسێك نیە هەڵە نەکات، وەك پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ (کل بني آدم خطاء وخیر الخطائین التوابون) (رواة الترمذي والأمام احمد)، واتە: هەموو ئادەمیزادەکان هەڵەدەکەن باشترین هەڵەکەرانیش تۆبەکەرانن.

## 15- جەختکردن لەسەر عەقڵ ڕۆشن کردنەوەو دڵ بێدار کردنەوە (التأكيد على تنوير العقول و إيقاظ القلوب)

مامۆستایانی بەڕێز! ئینسان دوو دەستگای زۆر گرنگی هەن، یەکێکیان شتی پێی کەشف و دەرك دەکا کە عەقڵە، یەکێکیشیان شتی پێ قبووڵ و رەفز دەکا یان شتی پێ خۆش دەوێ و پێی دەبوغزێنێ کە دڵ و دەروونیەتی، جا فەیلەسووفەکان خاڵی لاوازیان ئەوەبووە کە پشتیان تەنیا بە هۆشیارکردنەوەی عەقڵی خەڵك بەستوە، بۆیە سەیردەکەین ئەفلاطوون کۆماری خۆی نووسیوەو ئەرستۆو سوقراط شتیان نووسیوە، لەگەڵ هەبوونی هەڵەو پەڵەدا شتی باشیشیان نووسیوە، بەڵام ئەو شتە باشانە لە ژیانی خەڵکدا وەکو پێویست ڕەنگیان نەداوەتەوە، چونکە تەنیا قسەیان لەگەڵ جیهازی عەقڵی ئینساندا کردوە کە ئەوە خاڵی لاوازی فەیلەسووفەکان بووە، خاڵی لاوازی ئەهلی تەصەووفیش ئەوەبووە کە زیاتر سەرو کاریان لەگەڵ دڵ و دەروونی خەڵك دابووە لەسەر حیسابی عەقڵ و بەتەنیا لەگەڵ دڵی خەڵکدا خەریك بوون. بەڵام ئاخر دڵ و دەروونێك کە عەقڵێکی ڕۆشنی نەبێ بەهەڵەدا دەچێ، بۆیە سەیر دەکەین لە ڕێی تەصەووفەوە (شطحات)و قسەی بێ سەروبەرو ئەفسانەو بیدعەی زۆر هاتۆتە نێو مسوڵمانەتی یەوە.

بەڵێ ئیسلام لەگەڵ عەقڵ دەدوێ بۆ ئەوەی ڕۆشنی بکاتەوەو لەگەڵ دڵیش دەدوێ بۆ ئەوەی بێداری بکاتەوە، وە بەڕاستی دەبێ عەقڵ ڕۆشن بێتەوە بەزانیاری ڕاست و بە ئایەتەکانی خواو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) وە دڵیش هۆشیارو بێداربێ بۆ ئەوەی ئەو ئینسانە پاڵ پێوە بنێ بۆ شتی چاکە بە هۆی ڕێنمایی عەقڵەوە، بۆیە سەیر دەکەین خوای پەروەردگار کە باسی ئەرکەکانی پێغەمبەر دەکا (علیه الصلاة والسلام) لە چوار شوێن لە قورئاندا بەیەك شێوە باس دەکا، لە دوو شوێن لە سوورەتی (البقرة)و لە شوێنێك لە سوورەتی (آل عمران)و لە شوێنێك لە سوورەتی (الجمعة)، وە ئەرکە سەرەکییەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە چوار شـــتاندا کورت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ ﴾ (آل عمران ـ164، الجمعة ـ2) لە شوێنێکی دیکەشدا دەفەرموێ: ﴿ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾ (البقرة ـ129) ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە ڕستەی (يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ)ی لە هەموو شوێنان لە پێشەوەیە، چونکە پێشێ دەبێ تۆ عەقڵی خەڵك ڕۆشن بکەیەوە بە ئایەتەکانی خوا، چونکە ئەگەر خەڵك بە عەقڵ تێنەگا، نازانێ بەدڵ چی خۆش بوێ و ڕقی لە چی بێ، چی قبووڵ بکاو چی ڕەفز بکا!! دوای ڕۆشن بوونەوەی عەقڵ بێگومان پێویست بە تەزکیەی نەفسیش دەکا، بۆ ئەوەی ئەو زانیارییانە بە تەنیا زانیاری زەینی و زانیاری ساردو سڕی نێو مێشك نەبن، وەك ئەوەی فەیلەسووفەکان، بەڵکو

بچنە نێو دڵەوەو زانین بگـــۆڕێ بۆ توانین و حاڵی بوونەکە ببێتە حاڵ، وە ئینسان بجووڵێ، وە بە پێی ئەو زانیارییانە کە لە مێشکیدا کۆبوونەوە دڵەکەشی ڕۆشن و بێدار بێتەوەو ئەو ئینسانە بجووڵێ بەرەو ئەو شوێنەی کە شەرع دەفەرموێ.

## 16- گۆڕینی فۆنەتیك و شێوەی دەنگ لە بەرزو نزم کردندا بە گوێرەی بابەت (تغيير نبرة الصوت رفعاً وخفضاً حسبَ المقامْ)

یەکی دیکە لە بنەماکانی وتاربێژیی کە پێویستە وتاربێژ گرنگیی پێبداو ڕەچاوی بکا، بریتیە لەوەکە بە پێی قسەو باسەکانی سەر مینبەر وتاربێژ دەنگ و شێوازی دەربڕینی خۆی بگۆڕێ، هەمووتان دەزانن یەك تایم بوونی هەرشتێك ئینسان ماندوو دەکا، بۆیە پێچەوانەی حیکمەتیشە لە کاتێکدا بابەتێك پێویستی بە تووڕەبوون و حەماسەت هەبێ ئەو بە نەرم و خاوی بیلێ، وە کاتێك باسی شتێك پێویستی بە حوزن و دڵ نەرمیی بێ، دڵ نەرمییت پێوە دیارنەبێ، واتە بە پێی بابەتەکان ئینسان دەبێ دەنگی بەرزو نزم بکاو بیگۆڕێ، نەك شێوەی قسەکانی لە سەرەتاوە تا کۆتایی یەك شێوە بێ، چونکە بەڕاستی جاری وا هەیە وتاربێژ کە دەچێتە سەر مینبەرو لە یەك تایم دەست پێ دەکا تا لێدەبێتەوە، بیسەرەکانی خۆی و نوێژخوێنەکان زۆر تووشی مەلەل و ماندووبوون دەکا، بۆیە وتاربێژ دەبێ لە وتارەکەی بزانێ، کە جاری واهەیە بابەتێك پێویستی بەوە ناکات ڕقی خۆت هەڵسێنی و حەماسەتت بەرزبێتەوە، وامەکە، کە پێویستی بە عەطف و بەزەیی دەربڕین بکا با ئەو عەطف و بەزەیی یە لەوکاتەدا لە قسەکانتدا ڕەنگ بداتەوە، کە پێویستی بە قسەیەکی هێواش بکا، بە هەمان شێوە وا بکە، جاری واش هەیە نەخێر

پێویستی بە شێوەیەکی دیکە دەکا لە توندی و تووڕەیی لەو کاتەشدا بە پێی پێویستی شوێنەکە قسە بکە، کەواتە بەپێی بابەتەکان دەنگ و شێوەی دەربڕینت بگۆڕە کە ئەوەش هەر دەگەڕێتـــــەوە بۆ حیکمەت و لێزانیـــــی.

## 17- خۆپاراستن لە وشەو تەعبیری سووك و نەگونجاوو هەڵسوکەوتی نەشیاو (تجنب التعبيرات المشِينة والتصرّفات غير اللائقة)

ئەمەش بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی یەو وتاربێژ پێویستە لە خۆیدا بیهێنێتە دی و کە خۆی بپارێزێ لە وشەو تەعبیری سووك و ناشیرین و هەڵسوکەوتی نەشیاو، دیارە لێرەدا مەبەستم لە کاتی وتاردانە بە تایبەت، ئەگەرنا هەمیشە مسوڵمان دەبێ هەر بە نەزاکەت و سەنگین بێت، وەك: پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە پێناسەی ئیمانداردا دەفەرموێ: ((ليس المؤمن بالطعّان ولا اللّعان ولا الفاحِش ولا البذيّ))(12)، واتە ئیماندار توانج لێدەرو لەعنەتکارو جنێودەرو زمان پیس نیە، بەڕاستی دەبێ زۆر وریابین وتاربێژ نابێ وشەی بێنەزاکەت لەسەر مینبەری پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) بەکاربێنێ، وە نابێ وتاربێژ قسەو ڕەفتاری وا بکات کە خەڵکی عەوام ڕەخنە بگرێ کە چۆن مامۆستا دەبێ باسی فلان وشەیە بکات! چۆن دەبێ باسی فلان بابەتە بکرێ لەسەر مینبەری پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)؟! وتاربێژ دەبێ زۆر وریابێ، جاری واش هەیە وشەیەك لە شوێن و ناوچەیەك ناشیرینە، بەڵام لە شوێن و ناوچەیەکی دیکە ناشیرین نیە، دەبێ ئینسان لەوەش

(12) رواه أحمد و البخاري في الأدب و ابن حبان و الحاكم و صحَّحه السيوطي.

ئاگاداربێ، ئینسان دەبێ عورفی خەڵكی لەبەرچاوبێ، مامۆستایان دەبێ ئاگاداربن كە یەكێ لە سەرچاوەكانی یاسادانان بریتیە لە عورف و باوی خەڵك، عورفێك كە لەگەڵ ئایەتەكانی قورئان و فەرمایشـــــتەكانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دژ نەوەستێ، دەبێ ڕیعایەت و ڕەچاو بكرێ، جا بەڕاستی زمان پاكیی و ڕەوشـــــت جوانیی و بە ویقاریی و بە نەزاكەتی وتاربێژ زۆر دەور دەبینێ لە دروستبوونی كەســـــایەتی و كاریگەریی قسەكانیدا، ئنجا مەبەستم لە هەڵسوكەوتی نەشیاو ئەوەیە وتاربێژ دەنگی زۆر بەرز نەكاتەوەو زۆر دەستی نەجووڵێنێتەوە یاخود زۆر خۆی بەم لاولادا نەباو ئەگەر شتێك مایەی پێكەنین بوو بە قاقا پێنەكەنێ وە هەروەها...... ئەم شتانە لە وتاربێژ ناوەشێنەوە.

## 18- بوێریی و حەق بێژیی (الجرأة و قول الحق)

پێویستە وتاربێژ بە حیكمەت و لێزانیی یەوە ئەوەی بەهەق و ڕاستی دەزانێ بیڵێ هەر قسەو بابەتە لە شوێنی خۆیداو بە دادگەریـــــــی و ئینصافەوە، وە لە ڕووی دڵسۆزیی و پەرۆشەوە، بە تەئكید وتاربێژ دەبێ حەق بێژو بوێر بێ، ئەگەر وتاربێژ نەوێرێ هەق بڵێ با نەچێتە سەر مینبەری پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەڕاستی مینبەرو دوانگەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بۆ ئەوەیە كە حەقی لەسەر بگوترێ، بەڵام بە ئینصافەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَبْخَسُواْ النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ﴾ (الشعراء ـ183) واتە: شتی خەڵك بەكەم مەگرن، بێگومان ئەمە مەوریدەكەی تایبەتە بەڵام مەدلولەكەی گشتی یە، زانایانی (اصول) دەڵێن:(ان خصوص السبب لايمنع شمول المعنى)[13] كەواتە: ئەگەر یەكێك چاكەیەكی هەیە، با بە دادگەری چاكەكەشی باس بكەین و خراپەكەشی باس بكەین، ئەگەرنا دەبێ حەق بگوترێ، بەڵام لە ڕووی دڵسۆزی و پەرۆشەوەو ئێمە مەبەستمان ئەوە نەبێ خەڵك بشكێنین و خەڵك ناشیرین بكەین، یان تەشـهیر بە خەڵك بكەین، جا حكوومەتە، خەڵكە، حیزبە، كەسێكی تایبەتە، بەڵكو مەبەستمان دڵسۆزیی و پەرۆشیی بێ، بەڕاستی مامۆستایان! ئەو حاڵەتە نەفسیەی كە ئینسان بۆ خۆی هەیەتی زۆر

(13) واتە: تایبەت بوونی هۆ، ڕێ لە گشتگیربوونی واتا ناگرێ.

كاریگەرە لەسەر ئەو شوێنەوارە كە بەجێی دێڵێ و ئەگەر ئینسان دڵی خۆی پڕبكا لە ڕق وكینە بەرانبەر بەو خەڵكەی كە قسەیان ئاڕاستە دەكا، قسەكەی كاریگـــــەری نابێ و ئەوانیش لە بەرانبەردا ڕق و قین دروست دەكەن، جا ئەگەر هی واهەبێ لێی بوەشێتەوە كینەی هەبێ و خۆبەزل گریی و حەســـــەدی هەبێ، بەڵام مامۆستاو وتاربێژی ئایینی ئەوەی لــێ ناوەشێتەوە كە لەســـــەر مینبەری پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەوەستێت و ئایەتی خواو فەرمایشتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەخوێنێتەوە، نابێ كینەو بوغزو غەرەز پاڵی پێوە بنێ وە نابێ لە قسەكانیدا بێ ئینصاف بێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ **(وتواصوا بالحق)** یەكتر ڕادەسپێرن بە حەق، واتە دەبێ لەنێو خۆماندا یەكتر ڕابسپێرین بە حەق گوتن، وە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە فەرمودەیەكدا كە (ابو داود و احمد) ڕیوایەتیان كردوە، دەفەرموێ: ((افضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر)) لە ڕیوایەتی دیكەدا هاتوە كە هەر (ابوداود و احمد) ڕیوایەتیـــــان كردوە دەفەرموێ: ((سید الشهداء حمزة)) یان ((افضل الشهداء حمزة، ورجل قام الى سلطان جائر فأمرهُ ونهاهُ فَقَتَلْه))، بەڕاستی ئەم دوو فەرمایشتە زۆر جێی لــێ ورد بوونەوەن، ئێمە زۆرجار وادەزانین كە جیهاد تەنیا بریتیە لەوەی كە تەقە بكەی، بەڵام لێرەدا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ((أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر)) گەورەترین جۆری جیهادە نەك هەر جۆرێك لە جیهاد، بەڵكو

گەورەترین جۆری جیهاد بریتیە لە: قسەیەكی حەق لەلای دەسەلاتدارێكی ستەمكار، چونكە ئەگەر ئەو قسە هەقە هەبێ خەڵك وشیار دەبێتەوە، بەڵام ئەو قسە حەقە دەبێ باجیشـــی لەســـەر بدرێ، بەڵام خەڵك بەو قسە حەقەوە دەمێنێتەوە، ئەگەر قســـەی حەق و هەڵوێســـتی حەق و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ (باطل)و ئەهلی جەورو ستەمدا نەما، مانای وایە وەكو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ[14]: ((إذا رأیت أمتي تهابُ أن تقول للظالم أنت ظالمٌ فَقَدْ تُودِّع منها)) واتە: ئەگەر ئوممەتی منت بینی دەترسا لەوەی بە زاڵمێكی بڵێ تۆ زاڵمی ئەوە خوا حافیزی لـێكراوەو هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە، ئنجا دەفەرمـــوێ: گەورەی شـــەهیدان حەمزەیە، وە پیاوێك كە هەڵدەســـتێ بۆ لای دەسەلاتدارێكی ستەمكار فەرمانی پێدەكا بە چاكەو نەهی لـێدەكا لە خراپەو ئەویش دەیكوژێ، ئەو كەسە لەگەڵ حەمزەیەو لە دوای حەمزەوە دێت ((سید الشهداء حمزه ورجل)) لە ڕیوایەتێكی دیكە دەفەرموێ: ((ثم رجل) واتە: پلەیەك لە دوای حەمزەوە دێت (خوا لێی ڕازی بێ) حەمزەش پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە (سید الشهداء)ی ناو ناوە، كە ئەوە شتێكی زۆر گەورەیە، كەواتە ئێمە بەوە كە(أفضل الجهاد) ئەنجام دەدەین و دەچینە ڕیزی سەیدی شەهیدانەوە، باج دانی دەوێ، بەڵام ئەو باج دانە نابێ وامان لـێبكات كە لە حەق گوتن بسڵەمینەوە، ئنجا بەڕاســـتی حەق گوتنیش

(14) رواه أحمد. وقال الهيثمي في الجمع الزوائد : رِجالُهُ رجال الصَّحيح.

دەبێ بە شـــێوەیەكی حەق بگوترێ، خوای پەروەردگار دەربارەی قورئان لە سوورەتی (الأسراء)دا دەفەرموێ: ﴿وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ (105)﴾، واتە: قورئانمان بە حەق ناردۆتە خوارێ و حەقیشی تێدایە، واتە قورئان بۆ خۆی حەقە بەڵام شێوەی هاتنە خوارەوەكەشی حەقە، ئێمەش دەبێ حەق بڵێین، بەڵام بەشێوەیەكی حەقیش ئەو حەقە بڵێین، وەكو یەكێ لە زانایان دەفەرموێ: (أُؤْمُرْ بالمعروف وانْهُ عن المنكـر لا بالمنكـــر) واتە: فەرمان بە چاكە بكە بە شێوەیەكی چاك، وە قەدەغەی خراپە بكە بەڵام بە شێوەیەكی خراپ نا.

## 19- ئامادەيى باجدان لەسەر هەقبێژيى و پیشان نەدانى لاوازيى و پاشەكشە (الأستعداد لدفع ضريبة قول الحق و عدم إظهار الضعف والتراجع)

بەڵێ برايانى بەڕێز!

دەبێ باباى هەقبێژو بوێر، دڵنيابێ كە لەسەر هەقگوتنەكەى دووچارى كێشەو گرفت و سەرئێشە دێ و ئەهلى زوڵم و ستەم و خراپە لە بەرانبەر هەقگوتنەكەيدا كاردانەوەيان دەبێ جا زوو يان درەنگ، هەر بۆيەش خواى كاربەجێ لە سوورەتى (العصر)دا پاش ڕستەى **(وتواصوا بالحق)** فەرموويەتى: **(وتواصوا بالصَّبر)** چونكە خواى زاناو شارەزا (سبحانەو تعالى) زانيويەتى كە هەق بێژيى گرفت و كێشەو دەردەسەريى لە لايەن ئەهلى باطيلەوە بۆ هەقبێژان پەيدادەكات و ئەوانيش پێويستە بە قەڵغان و سوپەرى خۆڕاگريى (صبر) بەرەنگارى كاردانەوەى ئەهلى باطيل ببنەوە، ديسان هەر بۆيەش (لقمان) -خوا لێى ڕازى بێ- لە ئامۆژگاريكردنى كوڕەكەيدا پاش باسكردنى فەرمان بە چاكەو ڕێگرى لە خراپە، يەكسەر باسى خۆڕاگريى و دامەزراويى دەكات لە بەرانبەر بەڵاو گرفتاريى يەكاندا، وەك فەرموويەتى: ﴿ **يا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ** ﴾ (لقمان ـ17)، واتە: ئەى كوڕيژگەم ! نوێژ بەرپابكەو فەرمان بە چاكە بكەو ڕێگرى لە خراپە بكە،

وە لە بەرانبەر ئەوەدا کە تووشت دەبێ وە بەسەرت دێ خۆڕاگربە، بێگومان ئەوە ـ واتە خۆڕاگـــریی لە بەرانبەر بەڵاو گرفتارییدا ـ لەو کارانەیە کە پێویستی بە عەزم و ئیرادەی پتەو دەکات!

ئنجا گومانیشـــی تێدانیە کە لە کاتێکـــدا ئینسان چاوەڕوانی تاقیکرانەوەو بەڵاو گرفتاری دەکات لەکاتی تووشبوونیدا ناشڵەژێ و هاوسەنگی (توازن)ی خۆی لەدەست نادات پاشانیش سســـتیی و لاوازی ڕووی تێناکات و لە کاتی نارەحەتی و گرفتاریدا پاشەکشە ناکات!

ئاشکراشە کە کەسێك تەحەمولـی باج (ضريبة)دان نەکات و لەگەڵ یەکەمین نارەحەتیدا بەچۆك دابێ و بشڵەژێ و بلەرزێ:

یەکەم: لەسەر هەقـــگوتنەکەی قەرزدار بۆتەوەو کۆتایی هەڵوێستە هەقەکەی خۆی بە هەڵوێســـتێکی (باطل) هێناوەو سەرەتا باش ڕاساوە، بەڵام لە نیوەی ڕێییەدا کەوتوەو پساوەو پێی نەماوە.

دووەم: وە ئیسپاتی کردوە کە هەقگوتنەکەی یەکەمیشی تەنیا دڵگەرم بوونێکی کاتیی و حەماسە هەڵسانێکی بێبەرنامە بووەو پێشینان گوتەنی (سوار نەبووە بەڵام ئەسپ هەڵی گرتوە).

بۆیە هەرکات هەقمان گوت و بوێریی و ئازایەتیمان نیشاندا لەسەر مینبەری پێغەمبـــەری خوا ﷺ با کە لەمینبـەریش هاتینە خوار هەڵوێستی بوێرانەو جوامێرانەی خوار مینبەری پێغەمبەریشمان ﷺ هەر لەبەرچاو بێت و با ئەگەر لە هەقبێژییـــدا چاومان لێکردەوەو

کردوومانەتە سەرمەشق، لە خۆڕاگریی و تەحەممولی سەختییی دژوارییەکان و باجدانی هەقبێژیی و شوێنکەوتنی هەقیشدا هەر چاوی لێ بکەین و بیکەینە سەرمەشق، نەك تەنیا لە بواری قسەو وتاری سەر مینبەردا شوێنی بکەوین و لە بواری کارو هەڵوێستی خوار مینبەردا شوێن پێی بزر بکەین، چونکە: ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ (الأحزاب ـ21). هەموو هەڵسوکەوت و کردەوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگرێتەوە.

لە کۆتاییش دا دەڵێم:

لەراستیدا کەسێك کە پاش چوارقسەی هەق و ڕاست گوتن، بە چوار قسەی ناخۆش و هەڕەشەو گوڕەشە یان ماوەیەك زیندان و چەند زللەو قەمچییەك بشڵەژێو خۆی و دۆستانی زۆر سەغڵەت بکات و ...... هتد، بەو هەڵوێستە لاوازو بێ خێرەی هێندە ئیسلام و مەلاو مزگەوت ناشیرین دەکات، ئەگەر دەساڵان هەقی گوتبێ خۆی قەرزدار کردۆتەوەو کارێکی کردوە کە قازانجی سەری مایەی خواردوە!

بۆیە ئەگەر هەر کامێکمان کە لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ وتار بۆ خەڵکی دەدات و ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکات ئەم دووعایە بکات شتێکی زۆر بەجێیە:

خوای پەروەردگار!

یارمەتیم بدە کە ئەو قسەباشانەی لەسەر مینبەر بۆ خەڵکی یان دەکەم کە هـــاتمە خوارێ بە کردەوەی خراپ و هەڵوێستی نالەبارو هەڵسوکەوتی ناهەموار هەڵیان نەوەشـــێنمەوەو پەندی (وەستای قسان و کۆڵـەواری دەستان)م بەسەردا نەچەسپێ و نەکەوینە بەر حوکمی ئایەتی: **﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ۞ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ !﴾** (الصف ـ2،3)، وەسەرەنجام خەڵکێك بەهۆی وتارو قسەی باشی ئێمە بچێتە بەهەشـــت و خۆشمان بەهۆی کردەوە و هەڵوێستی خراپمانەوە بچینە دۆزەخ!

## 20- وتاربێژ دەبێ خاوەنی كەسایەتیەكی پاك و چاك و ڕاست و دامەزراو بێ (ینبغی للخطیب أن یكون ذا شخصیة نزیهة طیبة مستقیمة)

مامۆستایانی بەڕێز!

بەڕاستی قسەو ڕەفتارو هەڵوێستی ئینسان بەشێكە لە كەسایەتی ئینسان، ئینسان خۆی كەسایەتی یەكەی چۆن بێ قسەو هەڵسوكەوتەكانیشی هەروادەبن، دیارە زۆربەی مامۆستایانی ئێمە دەبێ سوپاس و ستایشی خوایان لەسەر بكەین، لە پاكی و نەزاهەت و ڕاستیی، بەڵام وتاربێژ دەبێ زۆر ئاگای لە كەسایەتی خۆی بێ و ئەوەی بە قسە لە شتی چاك دەیڵێ خۆی بە كردەوە جێبەجێی بكات و خاوەنی سیفەتی بەرزو پەسندی ئیسلامی بێ و، نموونەی پاكیی و ڕاستیی و تەواویی ئیسلام بێت و خووڕەوشتی بەرزو پەسەند لە خۆیدا بكاتە حاڵەتێكی چەسپیو، لە بواری خواپەرستی و عیبادەتی شەخصی و هەڵسوكەوت و دنیا بەكەم گرتن و دادگەریی و خۆپاراستن لە شتی خراپ و نارەواو پابەندیی بە شەرعەوە لەسەر ئاستی خێزان و پەروەردەكردنی منداڵ و ..... هتددا، چونكە وتاربێژ هەتا بۆخۆی چاكتر بێت قسەكانی كاریگەرییان زیاتر دەبێ لەسەر خەڵك، وە دەبێ هەوڵ بدات لە تەعامول

لەگەڵ خاوو خێزان و دەرو جیران و گەڕەك و هاوشاری و خەڵكیدا بە گشتی، هەڵسوكەوتی سەرچاوەی گرتبێ لە شەریعەتی خوا، بۆ ئەوەی لە وتارو بانگەوازدا سەركەوتوو بێت و قسەكانی جێی خۆیان بگرن و بەرهەمدار بن.

هەرچەندە جاری واش هەیە ئینسان بەدەست خۆی نیە كە كوڕێكی یان كەسێكی خراپ دەبێ، وەك چۆن (نوح) (علیه الصلاة والسلام) پێغەمبەر بووەو كوڕەكەی كافر بووە، بەڵام ئینسان دەبێ وریابێ و ئاگای لە خۆی بێ وەكو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ (المائدة ـ105)، ئەی ئیماندارینە ئاگاتان لە خۆتان بێ ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست گرتووبن ئەوانەی كە ڕێیان لێ ون بووە زیانتان پێ ناگەیەنن، بەڕاستی (گۆزە چی تێدابێ ئەوەی لێ دەڕژێ)و ئینسان قسەكەی لەقەدەر خۆیەتی و بە ئەندازەی ئەوەی كە ئیمان و عەقیدەكەی باشەو عیبادەتی چاكەو تەقوای باشەو تەزكیەی باشەو ڕەوشتی بەرز و جوانە، قسەكەشی باش دەبێ، كەواتە یەكەم دەبێ لە خوای پەروەردگار بپاڕێینەوە و داوای لێبكەین دوایی لەگەڵ خۆمان هەوڵ بدەین كە هەرچی زیاتر شەخسیەتی خۆمان بكەینە شەخسیەتێكی ئیسلامی، كە دەچینە سەر مینبەری پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) شایستەی ئەوەبین لەسەر مینبەری پێغەمبەر ﷺ ڕابوەستین وە بەڕاستی وەك لە كتێبی (زانایان)دا باسم كردوە ئەهلی عیلم دەبێ بە عیبادەتی

زیادە و بە ڕەوشـــتی بەرزو جوان و قورئان خوێندن و بە زیکـرو فیکری زیاترو زوهدو عەدل و بە هەموو شتێکی باش لە خەڵك جیابکرێنەوە، نەك تەنیا بەقسەکانیان، چونکە ئەگەر هەر قسەمان لە خەڵك زیاتربێ، ئەوە خەڵك ناکەوێتە ژێر کاریگەرییمان و شایستەی ئەوەش نین کە لەسەر مینبەری پێغەمبەر ﷺ بوەستین کۆتاییش بەو پەندە دێنم کە دەڵـێ: (عَمَلُ رَجُلٍ فِي ألف رَجُلٍ أَبْلَغ مِنْ قَوْلِ أَلْفِ رَجُلٍ فِي رَجُلٍ) واتە: کردەوەی پیاوێك لە هەزار پیاودا کاریگەرترە لە قسەی هەزار پیاو لە پیاوێکدا، خوای پەروەردگار وامان لێبکا کە بە کردەوەو ڕەفتار پێش قسەو وتار دینی خوای پەروەردگار لە خەڵك بگەیەنین .

وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه اجمعين

والحمد لله رب العالمين

شەممە

2006/11/11

هەولێر

# نێـوەرۆك

## ئەم نامیلکەیە

بیست (20) بنەمای گرنگی وتاربێژیی (الخطابة)ی تێدا خراونەڕوو کە ڕەچاوکردن و پێوەپابەندبوونیان بۆ هەر دواندەر (خطیب)ێکی سەرکەوتوو پێویستە.

دیارە ئینسانی مسوڵمانیش لەسەری پێویستە هەر ئەرك و کارێکی پێی هەڵسن بە چاکی و ڕێکی ئەنجامی بدات، چونکە خوای بەرزو مەزن (عزّوجل) لە چەندان شوێنی قورئانێدا مەدحی چاکەکاران (محسنین)ی کردووەو ڕایگەیاندوە کە خۆشی دەوێن: ﴿ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (آل عمران- 148) پێغەمبەری خواش ﷺ ئاگاداری کردووینەوە کە خوا پێویستی کردوە کە هەموو شتێك بە چاکیی ئەنجام بدرێ: (( إن الله تعالى كتب الأحسان على كلّ شيء)) رواه مسلم.

# ئەم نامیلکەیە

بیست «٢٠» بنەمای گرنگی وتاربێژیی «الخطابة»ی تێدا خراوەتە ڕوو، کە بەچاوکردنیان و پێوەپابەندبوونیان بۆ هەر دواندەر و «خطیب»ێکی سەرکەوتوو پێویستە.

دیارە ئینسانی مسوڵمانیش لەسەری پێویستە هەر ئەرک و کارێکی پێی هەڵسێ بەچاکی و ڕێکی ئەنجامی بدات، چونکە خوای بەرز و مەزن لە چەندان شوێنی قورئاندا مەدحی چاکەکاران (محسنین)ی کردووە و ڕایگەیاندووە، کە خۆشی دەوێن (والله یحب المحسنین) آل عمران: ١٤٨ پێغەمبەری خواش ﷺ ئاگاداری کردووینەوە کە خوا پێویستی کردووە، کە هەموو شتێک بەچاکیی ئەنجام بدرێ.

(إن الله تعالى كتب الإحسان على كل شيء) رواه مسلم.

عەلی باپیر



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: 2518138 – 2230908 – 2221695
موبایل : 07504605122 – 07701387291
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com